

له بڵاوكراوەكانی
زانكۆی گەشەپێدانی مرۆیی

# پزیشكیی دادیی

## له خزمەتی ماف و دادپارێزیدا

كمال حسن مجید





# پزیشکیی دادیی

## له خزمەتی ماف و دادپارێزیدا


مافناس

کمال حسن مجید


پێداچوونەوەی

دادوەر رزگار محمد أمين

د. بەرزان محمد علی دارتاش


٢٠١٦ ز

ناوی کتێب: پزیشکی دادیی لە خزمەتی ماف و دادپارێزیدا

بابەت: پزیشکی یاسایی

نوسینی: کمال حسن مجید

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٦ز

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپ و دیزاین: کۆمپانیای سازیار

ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (١٥٦٢)ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

لە بڵاو کراوەکانی زانکۆی گەشە پێدانی مرۆیی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿... وَلا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْها وَلا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرى...﴾

قورئانی پیرۆز/ سورەتی ئەنعام/ ١٦٤

هەرکەسێك کاری خراپ بکات هەر خۆی سزای دەبینێ، کەس تاوانی کەس هەڵناگرێت‌و، هیچ کەس لە تاوانی کەسی تردا سزا نادرێت.

ئیبن قەیمی جەوزی دەبێژێ:

﴿ نیشانەکانی دادپەروەریی بە هەر ڕێگایەك دەربکەون و بخرێنە ڕوو، ئەوە شەرع و ئایینی خوا لەو شوێنەیە... هەر ڕێگایەك دادپەروەریی و ماف پارێزی لێ بە دەست هات، ئەوە بەشێکە لە ئایین و، پێچەوانەی ئایین نی یە ﴾.

## سوپاس و پێزانین

وەك ئەمەكو لەبەرچاوبوون، سوپاسی بێ کۆتاییم ئاراستەی هەردوو بەڕێزان ( حاکم رزگار محمد أمين دادوەر لە دادگای پێداچوونەوەی هەرێمی کوردستان )و، ( د. بەرزان محمد علی دارتاش پسپۆڕی پزیشکی دادیی لە پەیمانگەی پزیشکی دادیی سلێمانی ) دەکەم، کە پێداچوونەوەی ئەم پەرتوکەیان کردو، هیچ کەمتەرخەمیان نەکرد لە تێبینیەکانیان، کە کاریگەریی بەرچاوی هەبوو لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە.

# پێشکەشکردن

پزیشکی دادیی لە خزمەتی ماف و دادپارێزیدا – ی نووسینی مافناس بەڕێز /**کمال حسن مجید**/م، بە چاوی هەڵسەنگاندن خوێندەوە، کارێکی گرنگو بەسوودی ئەنجامداوەو، خزمەتێکی باش بە بواری دادپەروەری دەکات، بە تایبەتیش بواری تاوانو لێکۆڵینەوە تاوانیەکان، خۆ ماندووکردنێکی پێوە دیارە، پشتی بە زۆر سەرچاوەی زانستی بەستووە کە سەنگی زیاتری داوەتە نووسینەکەی‌و، گرنگی پێگەی بابەتەکەشی نیشان داوە، بێگومان پزیشکی دادیی و لیژنە پزیشکییە پەیوەندیدارەکان نەك هەر ڕۆڵی گەورە دەبینن، بەڵکو پایەیەکی گرنگ و بنەڕەتین لە ساغکردنەوەو سەلماندنی کێشە تاوانیەکانی وەك: کوشتن، ئیفلیجکردن‌و پەککستن‌و، بریندارکردن‌و، دەستدرێژیە سێکسیەکان‌و، ڕووداوەکانی ئۆتۆمۆبیل ...هتد. جیاکردنەوەی تاوان لە حاڵەتەکانی خۆکوشتن و برینە خۆکردەکان‌و ڕووداوە رێکەوتەکان (عرضي)، هەروەها سەلماندنی باوك‌و فەرزەندی (نسب)، یان نەفیکردنی ئەو باوك‌و فەرزەندیە ، ئەمە جگە لە دیاریکردنی تەمەنی منداڵ و مێردمنداڵ یان گەورە کە بە فەرمی تەمەنەکەی دیاری نەکرابێت لە تۆمارگە یان بە ڕاستی نەنوسرابێ و لەگەڵ شێوەیدا نەگونجێ، ئەمانەش کاریگەریان هەیە لەسەر دیاریکردنی بەرپرسیاریەتی تاوان بە پێی تەمەن. هەروەها ڕۆڵی گەورە دەبینن لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیە عەقڵی‌و دەروونیەکان‌و کاریگەرییان لەسەر بەرپرسیارییەتی تاوانباریی، بەلابردنی یان کەمکردنی بەرپرسیاریی تاوانیی یان سوککردنی سزا. هەروەها ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە دیاریکردنی کەسایەتی قانونی کەسە سروشتیەکان (مرۆڤ) لە بواری مەدەنی‌و باری کەسێتیدا. بۆیە ئەزموونی زیاتر لە (٣٠) سیی ساڵ کاری دادوەریم بە خوێندنی (تیۆری‌و پراکتیك) ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێم دەڵێن: **ڕۆڵی پزشکی دادیی چەند گرنگ و بە ئەمەکە لە بواری عەدالەت و دادپەروەریدا**، دەتوانم بڵێم یەك ڕۆژ تێناپەڕێ بەسەرماندا بێ گەڕانەوەی دادگاکان بۆ ڕای پزیشکی دادیی و لیژنەکانی، بە تایبەتی لە دادگاکانی لێکۆڵینەوەدا.

لەوەش دڵنیام لە نەبونی ڕای زانستی‌و ڕاستی پزیشکی دادییدا چەندین تاوانی گەورە پەردە پۆش کراوەو دەکرێ‌و، تاوانبار وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچی‌و بە ئازادی دەسوڕێتەوەو، بێ تاوانیش هەندێ جار لەبەر نەبوونی ئەو ڕا زانستییە، یان هەڵە کوشندەکانی لێکۆڵینەوەی

نازانستی دادوەرو دادگای شاش‌و نەزان، یان نابەرپرس‌و کەمتەرخەم، دەکرێتە تاوانبارو دەکەوێتە کەماشەو داوی قانون بە دیوە ستەمکارەکەیداو، تەمەنێکی زۆر لە زینداندا بەسەر دەبات، یان لە سێدارە دەدرێت.

هیوادارم نوسینەکەی کاك (کمال) ڕۆشنیی‌و زانیاری زیاترمان پێبدا بۆ خزمەتی دادپەروەری‌و ڕێگە سەخت‌و مرۆڤانەکەی، دەستخۆشی لیّ دەکەم‌و ئومێدم وایە نووسینی زیاتری بخوێنینەوە....

دادوەر ڕزگار محمد امین

٢٠١٦/٢/٦

سلێمانی

# پێشکەشکردن

گومانی تێدا نیە پزیشکیی دادوەری یەکێکە لەو بوارە پزیشکیانەی لە پێناو دەستەبەرکردنی مافی ڕەوای تەواو بۆ مرۆڤەکان خزمەتێکی ڕەهای دادگاکان دەکات، ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندیەی لە ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئەو بوارەدا هەیە هەمیشە جێگای تێڕامانو، پلار لێدان و، ڕەخنەگرتن بووە، ئەوانەش بەهۆی نامۆیی بوارەکەوە بووە لەلایەن کۆمەڵگاو تەنانەت ناوەندە تەندروستیەکانیشەوە، بەبێ پەی بردن بەوەی پزیشکان و کارمەندانی بوارەکە لە پێناو سەروەریی یاسادا بڕیاری قوربانیدانو گیانفیدا کاریان داوە، بە ئامانجی بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی تەندروست لە ڕووی یاساوە ... ئەمە سەرەڕای ئەوەی بوارەکە هەم لە ڕووی زانستیەوەو، هەم لەڕووی بەرپرسیاریی یاساییو ویژدانیو یەزدانیەوە ئەرکێکی گرنگو مەترسیدارە. هەر بۆیە بوونی ئەم جۆرە نوسینانە زۆر گرنگن، بەتایبەتی نوسەر بە شێوەیەکی گشتی تیشکی خستۆتە سەر سروشتی کارکردن لە بوارەکەدا، بۆیە دەکرێت بۆ بە دەستهێنانی زانیاریو هۆشیاری وەك سەرچاوەیەك بەکار بهێنرێت، چونکە لە کۆمەڵگەدا کەم نین ئەو کەسانەی کە باس لە پزیشکیی دادیی دەکرێت تەنیا مردووەکانیان بە بیردا دێتو، سەبارەت بەبوارەکە هۆشیار نین. بۆیە من دەستخۆشی لە نووسەر ئەکەمو بە هیوای ئەوەی جێگە دەستی زیاتر دیار بێت.

د. بەرزان دارتاش

پسپۆڕی پزیشکی دادوەری

لە پەیمانگای پزیشکی دادیی سلێمانی

٢٠١٦/٣/٢٧

# پێشەکیی

خوای گەورە کە مرۆڤی دروست کرد، ڕێزی پێداو، کردی بە جێنشین لە سەر زەویدا، ﴿وَلَقَد كَرَّمنا بَنِى ءادَمَ وَحَمَلناهُم فِى البَرِّ وَالبَحرِ وَ رَزَقناهُم مِنَ الطَّيِّباتِ وَفَضَّلناهُم على كَثيرٍ مِمَّن خَلَقنا تَفضيلاً﴾. سورەتی ئیسرا/ ئایەتی ٧٠. هەموو دەستدرێژییەکیشی بۆ سەر ئازادیو ژیانی قەدەغە کردوەو، بە تاوان لە قەڵەمی داوەو سزای بۆ داناوە، هەرچەندە تاوانەکان زۆرن، بەڵام ناشیرینترین تاوان ئەوەیە بەرامبەر خودی مرۆڤ دەکرێت.﴿... أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفساً بِغَيرِ نَفسٍ أَو فَسادٍ فِى الأَرضِ فَكَأَنَّما قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً ...﴾، سورەتی مائیدە/ ئایەتی ٣٢. بەڵام ڕیشوی تاوان بە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕۆچووەو، چیرۆکی قابیلو هابیل نموونەی تاوانکاری مرۆڤەو، بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگەی مۆرڤایەتی تاوانی لێ نەبڕاوەو، هەموو سەردەمێکیش تاوانی تایبەت بە خۆی هەبووە، لەگەڵ پێشکەوتنی ئامرازەکانی ژیان بەردەوام تاوانیش زیادی کردوە، ئیتر بەپێی پێشکەوتنی کۆمەڵگە بۆ پاراستنی مرۆڤو، پیادەکردنی دادپەروەریو، ڕێکخستنی کۆمەڵگەو، سزادانی تاوانباران، یاسا دانراوە، لە هەمان کاتدا بە پێی سەردەم ئامرازی گونجاو بە کار هێنراوە بۆ دۆزینەوەی تاوانبارانو، ڕادەست کردنیان بە دادپەروەری. سنوردارکردنی تاوان یەکێك لەو ئارێشانەیە وڵاتان بۆ دابینکردنی ئاسایش بۆ کۆمەڵگەو تاکەکان هەوڵی بۆ دەدەن. ئەگەرچی لەناوبردنو قەڵاچۆکردنی تاوان کارێکی ئاستەمە، بەڵام بە هیواین لە ڕێی دۆزینەوەو، ڕاوەدونانو، قۆڵبەست کردنی تاوانبارانو، ڕادەست کردنیان بە دادپەروەریو، گەیاندنیان بە سزای خۆیان، لە تەسکترین سنوردا قەتیس بکرێت، چونکە دادپەروەری لە ژیانی گەلاندا داخوازییەکی گرنگو، پێوەرێکی سەرەکیی پێشکەوتنو، گەشە کردنە. چەندە تەکنەلۆژیا پێش دەکەوێتو، دەکرێت لەڕێیەوە تاوانباران بدۆزرێنەوە، لە هەمان کاتدا تاوانکارانیش هەوڵ دەدەن لە ڕێی هەمان تەکنەلۆژیاوە شوێن پێی تاوانەکانیان بزر بکەنو، لێکۆڵەرو دادوەر چەواشە بکەنو، بە ڕێگەیەکی تردا بیان بەن. یەکێك لەو لایەنانەی پسپۆڕە لە دۆزینەوەی تاوانو تاوانباراندا پزیشکی دادییە، پزیشکیی دادییش زانستێکی فراوانو، لقو پۆدارەو، گرنگی بە جەستەو عەقڵو دەروونی مرۆڤ دەدات، بۆ چارەسەر کردنی پرسەکانی تایبەت بە تاوانو تاوانکارانەوە زانستەکانی یاساو پزیشکیو بایەلۆجی یەکدەگرنو، زانستێکی نوێیان لێ دەکەوێتەوە پێی دەوترێ "پزیشکیی دادیی" ، بۆ ئەو دۆزو کەیسانەی لێکۆڵەرو،

دادوەر تیایدا دەستەوسانن‌و، پسپۆڕیی ئەوان نییە، پزیشکی دادیی بەڵگەی زانستی پێشکەش بە دەزگای دادوەری دەکات، تا لە ڕێی ئەو بەڵگانەوە بڕیاری دروست بدات. ئەوەی ئەرك‌و بەرپرسیارێتی پزیشکی دادیی بڵندو مەزن دەکات خزمەتکردنیەتی بە یاساو دادپەروەری. گرنگیەکەشی لەوەدایە بە شێوەیەکی هونەری‌و پراکتیکی بەڵگەکانی تاوان ئاشکرا دەکات کە دادوەر دەگەیەنێتە سەرەداوی ئەو تاوانە تەمومژاویانە، کە لە ڕێی لێکۆڵینەوەوە دەرناکەوێت، ئەگەرچی کاری پزیشکی دادیی کارێکی هونەری ڕووتە، بەڵام خەریکە بڵێین هاوبەشی دادوەرە لە بڕیارداندا، دەکرێ بوترێ لقێکی کۆمەڵناسیشە، سەرەڕای هاوکاری دادوەریی، پێوەرێکیشە بۆ زانینی تێکچونی باری کۆمەڵایەتی‌و، ڕودانی تاوانە جۆربەجۆرەکان‌و، دەتوانێ هاوکاری کۆمەڵناسانیش بکات لە دەستنیشان کردنی کەموکورتیەکان، بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان، **بەڵام ئەوەی جێی تێبینییە** پزیشکی دادیی جێگای شیاوی خۆی پێنەدراوەو، بایەخی ڕاستەقینەی نازانرێ. پسپۆڕانی بواری پزیشکیی‌و، یاسایش بە زمانی کوردی لەسەر ئەم بەشە گرنگەیان نەنوسیوە، لە کاتێکدا گەورەترین خزمەت بە مافی مرۆڤ‌و، دادپەروەری‌و، ئاسایش‌و، کەمکردنەوەی تاوان دەکات. ئەگەرچی ئەم نوسینە لە ئاستی شیاوی ئەم بابەتە نەبێت، بەڵام بە هەستکردن بە بەرپرسیارێتی ئەو ڕچەیەم شکاندو، ئەم نوسینە هاتە بوون. **"عیمادی ئەصفەهانی دەڵێ: هەر مرۆڤێك ئەمڕۆ پەڕاوێك دەنوسێت، سبەینێ دەبێژێ، ئەگەر ئەمە بگۆڕایە چاکتر بوو، ئەگەر ئەوە بخرایەتە سەری باشتر بوو، ئەگەر ئەمە پێش بخرایە ڕێکتر بوو، ئەگەر ئەمە نەبوایە جوانتر بوو، ئەمەش گەورەترین پەندو، بەڵگەیە لەسەر کەموکورتی مرۆڤ ."**. شایانی وتنە لەم نوسینەدا دەستم بۆ لایەنی پسپۆڕیی هونەری پزیشکی دادیی نەبردوە، چونکە باسەکە لەسەر زانستی پزیشکی دادیی نییە، بەڵکو لەسەر گرنگیی پزیشکی دادییە، کە چ خزمەتێك بە دادوەری دەکات لە پێشکەش کردنی شارەزاییی‌و، هێنانەوەی بەڵگەو، گونجاندنی یاسایی‌و، سەلماندن‌و نەسەلماندنی تاوان، کە هەموو ئەوانە خزمەتن بە دادپەروەریی .

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم بەشێك لە ئەرکی خۆم بەرامبەر ئەم بابەتە بەجێ گەیاندبێت.

کمال شێخ حسن /فەرمانبەری مافپەروەر لە پەیمانگای پزیشکیی دادیی سلێمانی

دووشەممە/٢٠١٥/٥/١٨

# بەشی یەکەم

ئەم بەشە پەیوەندیدارە بە چەمکی پزیشکیی دادیی‌و سیستەمەکانی‌و مێژووی سەرهەڵدانی و، مێژووی پزیشکی دادیی لە عێراقدا، باسەکەش لە سێ تەوەر پێکدێت .

**تەوەری یەکەم: مێژووی پزیشکی دادیی**

**تەوەری دووەم: پزیشکیی دادیی لە عێراقدا**

**تەوەری سێیەم: پزیشکی دادیی لە هەرێمی کوردستاندا**

# تەوەری یەکەم: مێژووی پزیشکیی دادیی و سیستەمەکەی:

## لقی یەکەم: چەمکی پزیشکیی دادیی :

زیادبونی تاوان و زۆربوونی ئامرازە بەکارهاتووەکان تیایدا بۆ زیان گەیاندن بەلاشەو دەروونی مرۆڤ – بە مەبەست بێت، یان بەبێ مەبەست بێت - بوون بە پاڵنەرێك بۆ زۆرێك لە پسپۆڕان و، لە ناویشیاندا پزیشکەکان، بۆ توێژینەوەی زانستیانە بۆ زۆرێك لە زانست و پسپۆڕیی پزیشکیی کە یارمەتی دەرە بۆ ئاشکرا کردن و قەڵاچۆکردنی تاوان و، گەیشتن بە ئەنجامدەرانیان. گەشەکردنی گەورەی زانستیی پێویستی کرد ددان بنرێ بەو هەموو پسپۆڕیانەدا، بۆ بەدەمەوەبونی پێویستیە داواکراوە بەردەوامەکان لە پسپۆڕان و، بەردەوامبونی ئەم بوارانە پێویستی کرد دەوڵەمەندکردنی هەریەك بۆ ئەویتر ببێت بە ئەرك، بە پێشکەوتنی ئەو زانستانە پەیوەندی نێوان پزیشکیی و یاسای تاوانەکانیش گەشەی کردو، ئەوەش بوو بە هۆی دروستبونی پسپۆڕییەکی پزیشکیی سەربەخۆ، ناوی لێنرا "پزیشکیی دادیی"، کە ئاماژەیە بۆ ئەو زانستەی تایبەتە بەو بابەتە پزیشکییە تایبەتانەی بۆ پیادەکردنی پێویستی بە دەقە یاسایەکان هەیەو، لە هەمان کاتدا یاساش پێویستی بە پزیشکیی دادیی هەیە لەسەر ئەو بەڵگەو ڕونکردنانەوە کە پزیشکیی پێشکەشی دادوەریی دەکات لەو کاتانەی کە بەو بەڵگەو ڕونکردنەوە پزیشکییە نەبێت ئەو تاوانە ناسەلمێنرێت. پێویستیی پزیشکییش بە یاسا لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، پیشەی پزیشکیی پێویستی بە یاساو سیستەمێکە کاری ئەم بەشە ڕێك بخات. پسپۆڕەکان ئەوەیان دەرخستووە "پزیشکیی دادیی" یەکێکە لەو زانستە پزیشکیانەی، تایبەتمەندە لە

چارەسەرکردنی لایەنی پزیشکیی لەو ڕوداوانەی دادوەریی دەیبینێ و، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیانداو، بۆ یەکلاکردنەوە پێویستی بە شارەزایی پزیشکیی و، شیکاری زانستیانەی دروست هەیە، ئەمەش پایەیەکی گرنگی کەمکردن و سنوردارکردنی تاوان و، پاراستنی ماف و، دادپەروەری یە. زاناو توێژەری زۆر لە هەردوو بوارەکەدا – پزیشکیی و یاسایی- پێناسەی چەمکی پزیشکیی دادییان کردوە، ئەگەرچی لە دەربڕیندا جیاوازبن،

بەڵام هەرهەموویان لە خاڵێکدا یەکدەگرنەوە، ئەویش پەیوەندی نێوان پزیشکیی‌و یاسایە. ئەم چەمکەش لە دو وشە پێکهاتووە، وشەی پزیشکیی و، وشەی دادیی .

**یەکەم: پزیشکیی:**

**أ – لەزماندا واتە: چارەسەرکردنی لاشەو دەروون، نەرمونیانی، شارەزاییی‌و لێهاتویی لەکاردا، ناسکیی .(١).**

**ب – لە زاراوەدا: پزیشکیی بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە تەندروستیی‌و لاشەی مرۆڤەوە هەیە، ئیتر بەمردوویی بێت، یان بە زیندویی .(٢).**

**دووەم: داد:**

**أ – لە زماندا واتە: پێچەوانەی ستەم، راست‌و دروست، هاوتاکردن، یەکسانکردن، ناوەنجی، پاداشت‌و سزا بەیەکسانی، لایەنگری نەکردن .(٣).**

**ب- لە زاراوەدا: داد یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان تاکەکان‌و، سەلماندنی مافەکانیانە، بە مەبەستی گەشتن بە ڕاستیەکان‌و، پراکتیزەکردنی دادپەروەریی .(٤).**

**بە پێشکەوتنی بەردەوامی زانستە جۆراوجۆرەکان پەیوەندیی نێوان پزیشکیی‌و یاسای تاوانکاریی گەشەی کرد، لەبەر ئەوەی پزیشکیی دادیی پسپۆرییەکی میانجگیری‌و، ئەڵقەی گەیەنەری نێوان پزیشکیی‌و یاسایە، زانایانی هەردوو بواری یاساو پزیشکیی پێناسەی پزیشکیی دادییان کردوە، ئەگەرچی شێوەی دارشتنەکانیان جیاوازن. بەڵام لەناوەرۆکدا کۆك‌وتەبان‌و، سەرجەمی هەموویان یەك مانا دەبەخشن، یان زۆر نزیکن لە یەکترەوە.**

**ئەمانەی خوارەوەش هەندێك لەو پێناسانەن:-**

أ – **د. وصفي محمد علي** لە (**الوجيز في الطب العدلي**) دا دەڵێ: ﴿پزیشكیی دادیی لقێكی پزیشكییە ، تایبەتە بەو پرسو كەیسانەوە كە یاساناسان لە دیدی پزیشكیی یەوە دەیبینن‌و، مامەڵەی لە گەڵدا دەكەن .﴾. (٥).

ب – **د.منصور عمر المعایطة** لە (**الطب الشرعي في خدمة الامن و القضاء**) دەڵێت: ﴿چەمكی پزیشكیی دادیی بە شێوەیەكی سەردەمیانە لقێكی پزیشكیی پراكتیكی یە، تایبەتە بە لێكۆڵینەوە لە هەموو زانیاری و شارەزاییە پزیشكییە دادییەكان‌و پراكتیزە كردنەكانیان، بە ئامانجی لێكدانەوەو ڕوونكردنەوەو، شیكاریكردنی ئەو پرسانەی پەیوەندییان بە كاروباری هونەریی و پزیشكیی دادییەوە هەیە، كە بابەتی لێكۆڵینەوەی پرسی دادگەری تیایاندا پەیوەندداره بە لاشەی مرۆڤ و هەر دەستدرێژییەك دەكرێتە سەری﴾. (٦).

ج – **د.كاظم المقدادي** لە (**الطب العدلي و التحري الجنائي** ) دا دەڵێت: ﴿پزیشكیی دادیی پراكتیزەكردن و پیادەكردنی هەموو زانست‌و شارەزاییە پزیشكییەكانە بۆ چارەسەر كردنی ئەو كەیسانەی دادوەر بە مەبەستی بەدیهێنان‌و، بەئەنجام گەیاندنی دادپەروەریی دەیانبینێت . كەواتە پزیشكیی دادیی كار لەسەر ئەو پەیوەندییە دەكات كە لە نێوان ڕووداوە پزیشكییەكان و ، دەقە یاساییەكاندا هەیە﴾. (٧).

د – د. **بەرزان دارتاش** – پسپۆڕ لە پزیشكی دادییدا لە پەیمانگای پزیشكیی دادیی سلێمانی – دەڵێت: ﴿ پزیشكی دادیی بەشێكە لە بەشەكانی پزیشكیی، هەڵدەستێت بە تاوتوێكردن‌و چارەسەركردنی پزیشكیی بۆ سەرجەم ئەو حاڵەتانەی كە لە لایەن دادگاكانەوە ئاراستە دەكرێن (مردوو بێت یان زیندو ) بە مەبەستی پەردەلادان لەسەر تاوان‌و ڕێگرتن لە ڕودانیان. هەربۆیە پزیشكی دادیی بە یەكێك لە گرنگترین كۆڵەكەكانی سەلامەتی كۆمەڵگا ئەژمار دەكرێت.﴾.

### لقی دووەم : زاراوە بەکارهێنراوەکان بۆ پزیشکیی دادیی :

پزیشکیی دادیی چەندین ناوی بۆ بەکارهێنراوە ، بەڵام کۆی ناوەکان هەر یەك مانا دەبەخشن، ئەویش پەیوەندی نێوان پزیشکیی و یاسایە. لە سەردەمانی دێریندا پێی وتراوە: (پزیشکیی مردووان)، هۆکاری ئەو ناولێنانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەشێك لە چالاکیەکانی ئەم بەشە بریتی بووە لە بینینی مردوو توێکاریی تەرم، لەوانەیە هەر ئەمەش بێت لە پسپۆڕییە پزیشکییەکانی دیکەی جیا بکاتەوە، کە یەکەمین و دوایین ئامانجیان پاراستن و چارەسەری نەخۆشییە، ناولێنانی پزیشکیی دادیی بە پزیشکیی مردووان لە لایەکەوە بەهای ڕاستەقینەو ئاستی پزیشکیی دادیی لە ناو سیستەمی تەندروستیدا ناگەیەنێت و، لەلایەکی دیکەشەوە ئەوەندەی ئەم بەشە پەیوەندی بە ژیانی تاکەکانەوە هەیە ناگەیەنێت . لە هەمان کاتدا ناشارەزایی خەڵك دەردەخات لە ئاست کارو گرنگیی ئەم بەشەی پزیشکیدا، لە بەرئەوەی بینین و توێکاریی تەرم ڕێژەی (١٠٪ - ٢٠٪)ی چالاکییەکانی پزیشکیی دادیی تێناپەڕێنێت . (٨).

لە هەمان کاتدا بەهۆی پێشکەوتنە زانستییەکان و کاریگەرییان لەسەر بەڵگەی زانستی و، پێشکەوتنی چەمکی مافی مرۆڤو، پاراستنی مافی قوربانیی لە گۆڕەپانی یاساییدا وادەکات پزیشکیی دادیی بە تەنیا پزیشکیی مردووان نەبێت، بەڵکو پزیشکیی دادیی لەم سەردەمەدا بڕبڕەی پاراستنی مافی بێتاوان و قوربانیانە لە بەردەم یاسادا، چونکە یەکێکە لە بەڵگە بە هێزەکانی ئاشکرا کردنی تاوانباریی، یان بێتاوانیی کەسەکان لەبەردەم دادوەردا. ئەم بەشەی پزیشکیی لەعێراقدا پێی دەوترێ (پزیشکیی دادیی) ، چونکە پێشتر ئەم بەشە پزیشکییە سەر بە وەزارەتی داد بووە، یان دەکرێت وەك بۆماوەیەکی مێژوویی لە تورکە عوسمانیەکانەوە وەرگیرابێت، چونکە پێشتر عێراق سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو، ئەوانیش ئەم زاراوەیان بەکار دەهێنا . پێیشی دەوترێ: (پزیشکیی یاسایی) چونکە پەیوەندی بە یاساوە هەیە . لە هەندێك وڵاتی وەك میسرو ئوردون و سوریاو لوبنان و سعودیە پێی دەوترێ : (پزیشکیی شەرعی) ، شەرعیش هەر بەمانای یاسا دێت . هەندێکی دیکە پێیان باشە پێی بوترێ (پزیشکیی دادوەری) ، چونکە وشەی دادوەری (قەزا) لە وشەکانی دادیی و یاسایی و شەرعی فراوانترە، کۆمەڵێکی تر ناویان لێ ناوە (پزیشکیی

تاوانکاریی) ، یان (پزیشکیی دادگا)، چونکە پەیوەندی بەو دووانەوە هەیە. لە زمانی ئینگلیزیشدا چەندین ناوی هەیە، بەڵام هەر هەموویان مانای پزیشکیی ویاسا دەگەیەنن، وەك: (Legal Medicine)، (Forensic Medicine) ، (Medical Jurisprudence) .( ٧ )

## لقی سێیەم: کورتەیەك لەمێژووی پزیشکیی دادیی :

### یەکەم: پزیشکیی دادیی لە بەرەبەیانی مێژوودا:

لە کاتێکەوە مرۆڤ هەستی بە ئازارو نەخۆشیی کردوە، پێویستی بە پزیشکیش هەبووە. بەڵام لە سەرەتادا پیشەی پزیشکیی تێکەڵی بیروبۆچونی ئەفسانەییو جادوگەری کرابوو. لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانی مرۆڤایەتیدا پزیشکییش پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیو، لقی جۆراوجۆری لێ بویەوەو، کاروبارەکانیشی بەیاسا ڕێکخرا. شەریعەتی (ئۆرگۆ)و، یاسای (لبت عەشتار)و، (ئەشنۆنا) لەعێراقدا بوونو، لەو یاسایانەشدا دستدرێژییە جەستەییو، سێکسیەکانو، جۆری سزاکانیشیان دیاری کران. بەڵگەنەویستە سەلماندنی ئەو دەستدرێژیانەش پێویستی بە لایەنێکی شارەزایی بوو، ئەوەش جۆرێك بوو لە مومارەسەی پزیشکیی دادیی – ئەگەرچی وەك هەموو زانستێکی سەرەتایی ناوی لێ نەنرا بوو- لە شەریعەتی حەمورابی دا سەرەڕای دیاریکردنی تاوانەکانو سزاکانیان، چەند ماددەیەکی تایبەت بە ڕەفتارو پیشەی پزیشکیی تێدا ڕێکخراوە، کە پزیشك لەسەرچی پاداشت دەدرێتەوەو، لەسەرچی سزا دەدرێت، ماددەکانی "٢١٥-٢٢٣" ی شەریعەتی حمورابی تایبەت کراون بە بواری پزیشکییەوە، ماددەی "٢١٥" دەڵێ: ﴿ ئەگەر پزیشکێك نەشتەرگەریەکی گەورەی بە چەقۆی نەشتەرگەری ئەنجامداو، چارەسەری نەخۆشیەکەی کرد، یان دومەڵێکی سەرچاوی بە چەقۆی نەشتەرگەری کردەوەو، چاوەکە پارێزراو بوو، پێویستە دە شیکڵی پێبدرێت﴾. ماددەی "٢١٦" دەبێژێ: ﴿ ئەگەر نەخۆشەکە ئازاد بوو، پێنج شیکڵ دەدرێت بە پزیشکەکە﴾. ماددەی "٢١٧" دەڵێ: ﴿ ئەگەر نەخۆشەکە کۆیلەی یەکێك بوو، ئاغاکەی دوو شیکڵ دەدات بە پزیشکەکە﴾. ماددەی "٢١٨" دەڵێ: ﴿ئەگەر پزیشکێك چارەسەری برینێکی ترسناکی پیاوێکی ئازادی بە نەشتەری برۆنز کردو، بوو

بەهۆی مردنی، یان دوملەڵێکی لە چاویدا کردەوەو، بوو بەهۆی کوێربوونی، هەردوو دەستی دەبڕرێ﴾. لە ماددەی " ٢١٩ "دا دەڵێ: ﴿ئەگەر لە ئەنجامی چارەسەر کردندا کۆیلەی پیاوێکی هەژار مرد، ئەوا دەبێت پزیشکەکە لە برییدا بە کۆیلەیەك قەرەبوی کەسەکە بکاتەوە﴾. لە ماددەی "٢٢٠"دا دەڵێ: ﴿ئەگەر دوملەڵێکی چاوی کۆیلەیەکی کردەوەو، بە هۆیەوە چاوی کوێر بوو، دەبێت، نرخەکەی بدات بە خاوەنەکەی﴾. ماددەکانی "٢٢١و٢٢٢و٢٢٣" باسی نرخی نەشتەرگەری دەکات، لە شەریعەتی حمورابی دا سزای سەخت دانرا بۆ نەشتەرگەر ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو، بەوەی پەنجەکانی یان هەردوو دەستی دەبڕێنەوە. ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەو سەردەمەدا ئەنجومەنێکی بەرزەفتکار هەبووە چاودێریی پزیشکەکانی کردوە. لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا ٣٠٠٠ ساڵ پ.ز. یەکەم دەستوری پزیشکیی دانرا، گرنگییان بە تەندروستی گشتی دا، لە تابلۆیەکی قوڕ لە (لکش) دۆزرایەوە، ناوی هەندێك ئامرازی نەشتەرگەرییو، ئامادە کردنی هەندێك دەرمان هاتووە، پزیشکێك واژۆی لەسەر کردوە ناوی (ئۆرد کالیدینا) یە، لەوانەیە ئەمە یەکەم پزیشك بێت ناوی نوسرابێت. (١٠). میسریە کۆنەکانیش لاشەی مردوویان مۆمیا کردووە، (ئەمەعتەب) ناوی یەکەم شارەزای پزیشکیی دادیی لێ دەنرێ، چونکە سەرۆکایەتی دادوەریی و پزیشکی تایبەتی فیرعەونی میسر (پاشا زویەر )ی بەیەکەوە کۆکردبوویەوە . بۆ یەکەمجار پێش زاین پزیشکی دادیی کاری پێکراوە، پڕاوپڕ لە کوشتنی (یۆلیۆس قەیسەر)دا دەوڵەت لیژنەیەکی لە پەرلەمان و پیاو ماقوڵانی ڕۆما پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆی مردنەکەی، لە ئەنجامدا ئاشکرا کرا کە مردنەکە پەیوەندی بە تاوانکارییەوە هەیەو ، قوربانییەکەش بیستو سێ خەنجەری لێدراوە . لە سەردەمی نوێشدا ئیتاڵیا بە پێشەنگ دادەنرێت لە بوارەکانی پزیشکیی دادیدا. بۆ دیاریکردنی پێکانەکان پزیشکی دادیی لە دادگاکاندا دامەزراند . نەشتەرگەری بەناوبانگ (هۆگر دی لۆکا) ساڵی ١٢٤٩ی زایینی بۆ کارکردن وەك شارەزای پزیشکیی دادیی لە پۆلۆنیا سوێندی خوارد. یەکەم کتێبی پزیشکیی دادیش ساڵی ١٥٧٦ زایینی بڵاوکرایەوە کەباسی هۆکارەکانی بریندار بوون و کوشتنی تێدابوو. لە سەدەی شانزەیەمدا پزیشکیی دادیی وەك سیستەمێکی سەربەخۆ دەرکەوت ، بەناوبانگترین پزیشکیش لە پزیشکیی دادیدا (پاولۆس لاکیاس) بوو ، لە نێوان ساڵانی ١٦٢١ – ١٦٣٥ ز کتێبی (پزیشکیی دادیی ) نووسی. (١١).

**دووەم: پزیشكیی دادیی له سەردەمی ئیسلامدا:**

هەموو زانستێك له سەرەتای پیادەكردنیدا، مۆركو چوارچێوەی تۆكمەی نییه، بەڵكو به تێپەڕبوونی كات فۆرمەڵه دەبێتو ڕواڵەت وەردەگرێت، پزیشكی دادیش بەو شێوه بووه، هەرچەند به پراكتیكی پیاده كرابێت، بەڵام چوارچێوەی زانستی نەبووه.

**أ - پزیشكیی دادیی له قورئانی پیرۆزدا:**

له دوو شوێنی قورئانی پیرۆزدا ئاماژه به دوو ڕوداو كراوه ، تیایاندا بۆ ئاشكرا كردنی تاوانبار پەنا بۆ ڕێگایەك براوه بریتییه له پشت بەستن به ڕەهەندێك نزیكه له شێوازی شارەزاییو، بەكارهێنانی بەڵگه له ئاشكراكردنی تاوانەكه، ئەوەش نزیكه له شێوازی پزیشكی دادیی، یان وەك بەڵگه هێنانەوه بۆ ڕەوایەتی كاری پزیشكی دادیی.

**روداوی یەكەم:** له ڕوداوێكی ئابڕووبەردا كه كارێكی سێكسیه، لەسورەتی یوسفدا بەسەرهاتی شەیدابوونی هاوسەری سەرۆك وەزیرانی میسر دەگێڕێتەوه، ژنەكه چۆن هەوڵی داوه یوسف پێغەمبەر –علیه السلام- بخاته داوی خۆشەویستی خۆیەوه، پاش ئەوەی یوسف خۆی نەدا بەدەستەوەو، بۆی ڕام نەكرا، له ئەنجامدا ژنەكه پیلانێكی بۆ داڕشت، بانگی كرده ژوورەوەو، دەرگاكانی لێ داخستو، داوای لێكرد ئەو تاوانەی لەگەڵدا ئەنجام بدات، یوسفیش –علیهالسلام- ڕایكرد بۆ دەرەوه، ژنەكەش له پشتەوه كراسەكەی ڕاكێشاو، كراسەكه له پشتەوه دڕا، لەو كاتەدا مێردەكەی له بەر دەرگا ئامادە بوو، ژنەكه وتی: ئەو پەلاماری داوم، یوسفیش وتی: من بێ تاوانم، یەكێك لەخۆیان وتی: ئەگەر كراسەكه له پێشەوه دڕابوو ئەوه تاوانی یوسفه، ئەگەر كراسەكه له پشتەوه دڕابوو ئەوه تاوانی ژنەكەیه، سەیریان كرد كراسەكه له پشتەوه دڕابوو، بەو شێوه زانرا پیلانەكه تەڵەكەبازی ژنەكه بووه. لەم ڕوداوەدا ڕۆڵی شارەزایی به ئاشكرا دیاره له دەستنیشان كردنی تاوانبارو، وەك ئامرازی سەلماندنو، وەك بەڵگه وەرگیراوه.

**ڕوداوی دووەم:** چیرۆكی تاوانی كوشتنه، له سەردەمی موسی پێغەمبەردا –علیهالسلام- كۆمەڵێ كەس خزمێكی دەوڵەمەندی خۆیان دەكوژن، تا سامانەكەی بەمیرات ببەن. بۆ ئەوەی به بەردێك سێ چۆلەكه بكوژن پیلانێكیان داڕشت، ڕۆشتنه لای موسی پێغەمبەر -

علیەالسلام- سکالآیان لە دژی کەسێك تۆمار کرد، گوایە خزمەکەیان لەلایەن ئەوەوە کوژراوە، ئەگەر ئەو پیلانە سەری بگرتایە ئەوە بکوژی ڕاستەقینە بزر دەبوو، سامانی خزمەکەشیان دەخواردو، خوێنی کوژراوەکەشیان دەسەند، کەسی تۆمەتبارکراو هێنرایە لای موسی پێغەمبەر. پاکانەی خۆی کرد، لەم تاوانە گەورەیەدا کە کوشتنی مرۆڤێکەو، خواردنی سامانەکەیەتیو، تۆمەتبارکردنی کەسێکی بێ تاوانو خواردنی سامانی ئەویشە، بۆ ئەوەی موسی لە بڕیارداندا نەکەوێتە هەڵەوە، خوای گەورە ئیلهامی بۆنارد کە مانگایەك سەربیڕنو، بە پارچەیەك لە گۆشتەکەی لە تەرمی مردووەکە بدەن، زیندوو دەبێتەوەو، هەواڵتان دەداتێ کێ کوشتویەتی. بەو شێوە بکوژی ڕاستەقینە دەرکەوتو، بێ تاوانیی تۆمەتبارکراوەکە سەلمێنراو، پیلانەکە ئاشکرا بوو، دادپەروەری چەسپاو، مافی بێ تاوانەکەش پارێزرا.

**ب – ئیمامی علیو پزیشکی دادیی:**

لە مێژووی ئیسلامیدا ئیمامی علی –ڕەزای خوای لەسەر بێت- بە دیارترین دامەزرێنەری پزیشکیی دادوەری دادەنرێ، چونکە یەکەم کەس بووە لە بڕیاری دادوەریدا پشتی بە زانستو زانیاری بەستووە. لەم دوو ڕوداوەی خوارەوەشدا شارەزاییو، پرۆسەی پزیشکیی دادیی زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێ. (١٢).

**روداوی یەکەم** لە سەردەمی ئیمامی عمردا ژنێکیان هێنا داوێن پیسی کردبوو، ئەویش فەرمانی دا سزا بدرێ، درایە دەست چەند کەسێك بردیان سزای بدەن، ئیمامی علی لە ڕێگا پێیان گەشت، وتی: ئەمە چی یە؟ وتیان : زینای کردووەو، ئیمامی عمر بڕیاریداوە سزا بدرێ، ئیمامی علی لە دەستی سەندنو، ئەوانی ناردەوە، کە ڕۆشتنەوە عمر وتی: بۆچی گەڕانەوە؟ وتیان: علی گەڕاندینیەوە، عمر وتی: دیارە علی شتێکی لێ دەزانێ، ناردی بە شوێن ئیمامی علی دا، کە هات ئیمامی عمر وتی: بۆچی ئەوانەت گەڕاندوەتەوە؟ وتی: نەتبیستوە پێغەمبەر –درودی خوای لەسەر- فەرمویەتی: سێ کەس سزا نادرێن ( ... شێت تا ئەوکاتەی شێتیەکەی نامێنێ)؟ عمر وتی: بەڵێ بیستومە، علی وتی: ئەم ژنە شێتە.

ئیتر عمر هیچی نەوت، لێرەدا ئیمامی علی باری دەروونی ژنەکەی خوێندەوەو، بەرپرسیارێتی سزایی نەدا بەسەریدا، بەو شێوە سزای لەسەر هەلگرت .

ڕوداوی دووەم: ژنێك گەنجێکی خۆش دەویست، هەرچەند هەوڵی دەدا گەنجەکەی بۆ ملکەچ نەدەبوو. ژنەکە داوێکی بۆ دەتەنێ، هێلکەیەك دێنێو، زەردێنەکەی فڕێ دەداتو، سپێنەکەی دەدات لە کراسەکەیو، نێوان هەردوو ڕانی. پاشان بە قیژاندن دەڕوات بۆلای ئیمامی عمرو، دەڵێ: ئەم پیاوە بە زۆر کاری سێکسی لەگەڵ کردومو، ئەوەش شوێنەواری کارەکەیەتی بە جەستەمەوە، عمر چەند ژنێکی نارد بۆ سەیرکردنی، ژنەکان وتیان: سپێرمەکەی بە لاشەوەیە، عمر ویستی سزای گەنجەکە بدات، ئەویش: پاڕایەوە، سوێندی خوارد لاقەی ئەو ژنەی نەکردوەو، وتی: پەلە مەکەن، بیسەلمێنن، پاشان سزام بدەن. عمر وتی: علی چی بکەم؟ علی سەیری کراسی ژنەکەی کرد، وتی: ئاوێکی بە کوڵ بێنن، کە هێنایان کردی بە سەر کراسی ژنەکەدا، دیتی سپێنەی هێلکەکە بەستی. بۆنی کرد زانی سپێنەی هێلکەیە، توڕە بوو لە ژنەکە، ئەویش ددانی نا بە پیلانو تاوانەکەیدا. بەو شێوە بێ تاوانیی گەنجەکەی دەرخستو، لە سزای ناهەق رزگاری کردو، مافی پاراست.

## لقی چوارەم: گرنگیی پزیشکیی دادیی لە کۆمەڵگەدا :-

### یەکەم: گرنگیی پزیشکیی دادیی لە پاراستنی مافەکاندا:

١ – ماف لە زماندا واتە: ڕەوا، شایستەبوون، چەسپاو، جێگیر.

٢ – لە زاراوەدا: ماف ئەو پێگە یاساییەیە خاوەنەکەی یان کەسێکی تر دەتوانێت سودی لێ وەربگرێت.(١٣).

یان ماف: ئەو تواناو، دەستەڵاتە خۆ ویستەیە کە یاسا دەیبەخشێ بە کەسێك لە کەسەکان لە چوارچێوەی یاسادا. (١٤).

لەم پێناسانەی سەرەوەدا دەردەکەوێ هەموو مرۆڤێك پێگەو پلەیەکی تایبەتی خۆی هەیەو، بۆ هیچ کەسێکی دیکە نییە بەبێ ڕێکاری یاسایی بیبەزێنێ، چونکە ئەو مافە بە

یاسا چەسپاوە، ڕێزو پاراستنی لاشەی مرۆڤیش گرنگترین مافی مرۆڤە کە تاك‌و کۆمەڵگە بە یەکسانی سودی لێ دەبینن، ئەگەر کۆمەڵگە پارێزگاریی لەو مافە نەکات ئەوا ناتوانێت وەك کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو گەشە بکات. ئامانجی یاسای سزاکان لە بە تاوان ناساندنی لێدان‌و، بریندارکردن‌و، پێدانی ماددەی زیانبەخش بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ‌و، سەلامەتی لاشەیە. ئەم مافەش ئەو بەرژەوەندیە یاسایەیە کە یاسا دەیپارێزێت، تا جەستە بتوانێت بە شێوەیەکی ئاسایی فەرمانەکانی ئەنجام بدات‌و، هیچ ئەندامێکی جەستە لەکار نەکەوێ، ئەگەرچی بۆماوەیەکی کاتییش بێت. بۆیە یاسادانەر پارێزگاری لە جەستە دەکات، چونکە ئەم مافە پەیوەندداره بە مافی ژیانەوە. بەڵام لە ئەنجامی تاوانکاریەوە، دەستدرێژی دەکرێتە سەر ئەو مافە، دادوەریش هەوڵ دەدات تاوانبار بدۆزێتەوەو، بە سزای خۆی بگەیەنێت‌و، ماف بۆ خاوەن ماف بگەڕێنێتەوە. بەڵام هەموو جار دادگا ناتوانێت تاوانبار بدۆزێتەوە، بۆیە پەنا بۆ لایەنێکی تر دەبات کە شارەزابێت لەو بوارەدا، ئەو لایەنەش پزیشکیی دادیی دەتوانێت جۆری تاوان‌و، تاوانبار دەستنیشان بکات‌و، دادگاش لەو ڕێگایەوە مافی قوربانیان بپارێزێ. لە لایەکی ترەوە زۆر جار کەسێکی بێ تاوان تۆمەتبار دەکرێ، ئەوەش بۆ مەبەستێکی تایبەت، یان بۆ ڕزگارکردنی تاوانبارێکە، پزیشکیی دادیی ئەو سەرچاوە زانستیە گرنگەیە دەتوانێت بێتاوانیی ئەو تۆمەتبارکراوە بسەلمێنێ. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە پزیشکیی دادیی چ ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە پاراستنی مافی تاکەکاندا، لە درێژەی باسەکەدا ئەمە بەتەواوی ڕوون‌و ئاشکرا دەبێت بۆ خوێنەر.

### دووەم: گرنگیی پزیشکیی دادیی لە ئاشکراکردنی تاواندا:

لەم سەردەمەدا پزیشکیی دادیی بووە بەیەکێك لە زانستە بنەڕەتییەکان‌و، بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان دەسەڵاتی دادوەریی پشتی پێدەبەستێت، پزیشکیی دادیی لەو زانستانە دەژمێرێت کە پشت بە پشکنین‌و شیکاریی‌و، لێکدانەوەی زانستی وردو دروست دەبەستێت بۆ هەموو نیشانەو گۆڕانکاری و بینینەکان‌و، زانیارییە پزیشکییە دادییەکانیش بە باشترین شێوە بەکاردێنێت بۆ خزمەتکردنی دادپەروەریی . لە دیدی دادوەرییەوە پزیشکی دادیی ئەو شارەزایەیە کە ڕاوبۆچوونی خۆی لە بارەی ئەو شتانەوە دەردەبڕێت کە سروشتی پزیشکییان هەیەو تایبەتن بە تاکی قوربانییەوە، زیندوو بێت یان مردوو-

پزیشکیی دادیی بەهۆی ئەزموونەکانیەوەو لە میانەی زانیارییەکانیەوە بۆ یاسای پزیشکیی، لە ژیانی رۆژانەدا راوێژکاری یاساییە بۆ پیادەکردنە یاساییەکان. کەواتە پزیشکیی دادیی فەرمانێکی دوو لایەنە ئەنجام دەدات، لە لایەکەوە راوێژکاری پزیشکیی کارگێڕی و دادوەری یەو، لە لاکەی دیکەوە راوێژکاری یاسایی دەستەی پزیشکییە . لە جیهانی تاوانکاریدا پزیشکیی دادیی گرنگیەکی گەورەی هەیە، لەو کاتەی لێکۆڵینەوە دەستەوسان دەبێ لە دۆزینەوەی تاوانو، تاوانکارو، دۆسیەکە دەنێردرێ بۆ هەڵگرتن، ئەوە پزیشکیی دادییە، توانای دۆزینەوەی سەرەداوی تاوانەکەی هەیە. بۆیە بەو رێگا زانستیە دادەنرێ کە لێکۆڵەر دەگەیەنێتە دۆزینەوەی تاوانە ناڕوونەکانو، زانینی راستیەکانو، کۆکردنەوەی بەڵگەو گرینەکان کە یارمەتیدەر دەبن بۆ دۆزینەوەی تاوانبارانو، رەوانەکردنیان بۆ بەردەم دادگا. لەهەمان کاتدا یارمەتیدەرە بۆ (التكييف القانوني) گونجاندنی یاسایی رووداوەکان. لەم سەردەمەشدا پزیشکیی دادیی بە چەقی بنەڕەتی دادەنرێ لە یارمەتیدانو هاوکاری دادوەریی لە پشکنینی تاوانو، کەتنو، شارەزاییە پزیشکییە جۆراوجۆرەکان، بۆیە لە پرۆسەی سکاڵا کردندا رۆڵێکی سەرەکیی هەیە، ئەوەش بە دەستنیشان کردنو دیاریکردنی جۆری ئەو دەستدرێژیانەی کە دەکرێنە سەر قوربانیەکان، لە ئامرازەکانی پێکانو، جۆرەکەی‌و، شێوازەکەی‌و، کاتەکەی‌و، ئەو دۆخەی تاوانەکەی تێدا ئەنجام دراوە. لە زۆربەی کەیسەکانیشدا تاوانباری راستەقینە ئاشکرا دەکات، لەم سەردەمەدا هاوشانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا ئامێر و شێوازی تاوانکارییش پێشکەوتووە، ئەوەش پرۆسەی هەڵهاتن و دەربازبونی تاوانباری لە شانۆی تاوانەکە ئاسانتر کردووە. تاوانبار هەمیشە لە هەوڵی شاردنەوەی نیشانەی تاوانەکەیدایە، بەڵام پزیشکیی دادیی لایەنە شاراوە و تاریکەکانی تاوانەکە دەردەخات و روونی دەکاتەوە، بەڵگەکانیشی پشت ئەستورن بە زانست، بۆیە هەمیشە پەراوێزی هەڵەکردن کەمتر دەکاتەوە، بەوەش دادپەروەری جێگیرتر دەبێت. دەستوری کۆماری عێراقی ٢٠٠٥ز لە بەشی دووەم (ئازادییەکان) لە برگەی (ج)ی ماددەی (٣٧) دەڵێ: ﴿ **هەموو جۆرە سزادانێکی دەروونیو جەستەییو مامەڵەیەکی نامرۆڤانە یاساغەو، هەر دانپیانانێك بەزۆر یان هەڕەشە یان ئەشکەنجە دەربهێنرێ، جێی بایەخ نییەو، زیان لێکەوتوو بۆی هەیە بە پێی یاسا داوای قەرەبوو بکات** ﴾. گرنگیەکی تری پزیشکیی دادیی ئەوەیە کە بۆ دۆزینەوەی تاوانکار پشت بە بەڵگەی زانستی دەبەستێت و،

بۆ دەستخستنی زانیاری لە تاوانبار پەنا بۆ ئەشکەنجە و لێدان نابرێت، بەوەش مافی مرۆڤ پارێزراوتر دەبێت. بە کورتی: پزیشکیی دادیی ئەو پسپۆڕیە پزیشکیەیە کە زانستە پزیشکیەکان دەخاتە خزمەت دادپەروەریەوە، ئەویش لە رێگای ئاشکراکردن‌و دۆزینەوەی بەڵگەی ماددی لە تاوانەکانی کوشتن و ئازاردان و تاوانی سێکسیدا، یان لەرێگای سەلماندنی ناڕاستیی بانگەشە لە کەیسێکی دیاریکراودا، کاتێك بانگەشەکە پەیوەندی بە کاروباری تەندروستی و پزیشکیەوە هەبێت، بەوەش بێتاوانێك ڕزگار دەکات کە بە ناڕەوا تاوانێکی بخرێتە ئەستۆ.

## لقی پێنجەم: سیستەمە پزیشکییە دادیەکان لە جیهاندا :- (١٥):

سیستەمی پزیشکیی دادیی کۆمەڵە دیسپلین‌و، ڕێنماییەکە بەهۆیانەوە کاری پزیشکیی دادیی بەڕێوە دەچێت‌و، بە گوێرەی جیاوازیە یاسایی‌و سیاسی‌و جوگرافیەکانی دەوڵەتانی جیهان دەگۆڕێت، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین سیستەمی پزیشکیی دادیی لەجیهاندا بۆ دوو سیستەمی سەرەکی دابەش بکەین:-

**یەکەم: سیستەمی ئەنگلۆسەکسۆنی:** ( Anglosoxonian Code ) ئەمە سیستەمی بەریتانی‌و، ئەو وڵاتانەیە لە لایەن ئەوەوە داگیرکرابوون.

**دووەم: سیستەمی ناپلیۆنی:** ( Napoleon Code)، ئەمە سیستەمی فەرەنسی یەو، لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپیەکاندا کاری پێ دەکرێ. لەو دوو سیستەمە کۆمەڵێك سیستەمی پزیشکیی دادیی دروست بوون‌و، جیابوونەوە. لەو سیستەمانەش :

ا - **سیستەمی کۆرۆنەر** (Coroner ): ئەم سیستەمە لە ئینگلترەو، ویلز پیادە دەکرێت، بە باشترین سیستەمی پزیشکیی دادیی دادەنرێ لە جیهاندا. وشەی (کۆرۆنەر) بۆ کەسێك بەکار دێت، پلەیەکی دادوەرەی هەیە (دادوەری لێکۆڵینەوە)، واتە: بڕوانامەو پلەیەکی یاسایی‌و، بڕوانامەیەکی پزیشکیشی هەیەو، خاوەنی ئەزموون‌و، شارەزاییەکی باشەو، بۆ ماوەیەکی گونجاویش مومارەسەی لەسەر ئەو کارانە کردوە کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە. لەلایەن دەوڵەتەوە کراوە بە لێپرسراوی کانتۆنێکی دیاریکراو بۆ کاری پزیشکیی دادیی. ئەو تەرمانەی گومان لە مردنەکانیاندا هەبێت ڕەوانە دەکرێن بۆی، بۆ

ئەوەی هۆی مردنەکەی بزانێت‌و دیاری بکات، وەك مردنەکانی: (برینداریی بەهەموو جۆرەکانیەوە، ڕوداوی چەك، ڕوداوی هاتوچۆ، خنکاندن، ژەهراویبوون، ڕوداوە سروشتیەکان، نقومبوون لەئاودا، مردنەکانی ناوزیندان، مردن لەکاتی کارکردندا، مردنی منالی تازە لەدایکبوو). مەبەستی ئەم سیستەمە بە پلەی یەکەم زانینی هۆی مردنەکەیە، پاشان بەدواداچوونە بۆ بوون‌و نەبوونی پالنەری تاوانکاریی لە مردنەکەدا، واتە: گرنگیی بە کاری زانستی‌و، توێژینەوە دەدات. لە سەرەتادا کۆرۆنەر تەرمەکە دەبینێ، پاشان خۆی بڕیار دەدات ڕەوانەی پزیشکیی دادیی بکرێت بۆ پشکنین یان نە، کۆرۆنەر نزیکەی لە ٨٥-٩٥٪ یان زیاتری مردووەکان توێکاریی دەکات. –لەم سیستەمەدا کۆرۆنەر تەنیا مردو دەبینێ‌و، زیندو نابینێ - ئەم سیستەمە سیستەمێکی تەواوکەرە، بەلام لە لایەنە نێگەتیڤەکانی ئەوەیە پێویستی بە ئاسانکاری‌و، کادیری زۆر هەیە. ئەم سیستەمە لە ئینگلتەرەو ویلزو ئوسترالیاو نیوزیلەندەو، هەندێك ویلایەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پراکتیزە دەکرێت. بەلام زیندووەکان پزیشکێکی دیکە پشکنینیان بۆ دەکات پێی دەوترێ: پزیشکی سیاسی یان (نەشتەرگەری سیاسی) .

ب - **سیستەمی پشکنەری پزیشکیی،** (Medical examiner) ئەم سیستەمە لە بەشێك لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پراکتیزە دەکرێ. لێرەدا پزیشك لە گەل دەسەلاتە پزیشکیەکەی دەسەلاتی پاسایشی پێدراوە، ئەوەش ئاسانکاری زۆری بۆ دەکات لە کارەکەیدا، پزیشکی دادیی پسپۆڕ دەسەلاتی ئەوەی هەیە بڕیار بدات تەرمەکە پێویستی بە توێکاری هەیە، یان نە، بۆی هەیە لەگەل لێکۆلەردا سەردانی شوێنی ڕوداوەکە بکات‌و، چاوی بە تاوانبارەکەش بکەوێت

ج - **سیستەمی کۆنتینێنتال**- ( Continental system ) ئەم سیستەمە لە فەرەنساو، زۆربەی ولاتانی ئەوروپیدا هەیە، لێرەدا دادوەریی‌و لێکۆلینەوە لە لایەکەوەن‌و، پزیشکیی دادیش لە لاکەی ترەوەیە، لایەنی لێکۆلینەوە بڕیار لە سەر هەوالەکردنی کەیسی مردوو، یان زیندو دەدات بۆ پزیشکیی دادیی، پزیشکیی دادیش بە پلەی یەکەم جێ بەجێ کارەو، هیچی تر. مەبەستی سەرەکیش جیاکردنەوەو دیاریکردنی تاوانەکانە، بە پلەی دووەمیش زانینی هۆی مردنەکەیە. بەراورد بە سیستەمی کۆرۆنەر، لەم سیستەمەدا

تونێکاریی زۆر کەمترە. لە گرفتەکانی ئەم سیستەمە ئەومیە لایەنی لێکۆڵینەوە یان دادوەریی کە دەسەڵاتی ڕەوانەکردنی کەیسەکانی بە دەستە، تەنیا شارەزایی یاسایی هەیەو، شارەزایی پزیشکیی نییە. لە زۆربەی کاتەکاندا پزیشکی مردووان‌و زیندوان هەر هەمان پزیشکە. ئەمەش هەوڵ‌و، تواناکان پەرتەوازە دەکات .

**د - سیستەمی فیسکاڵ:** ( Procurator Fiscal) ئەم سیستەمە تەنیا لە ئۆسکەتلەندا پراکتیزە دەکرێت. هەندێك لە تایبەتمەندی سیستەمی کۆرۆنەرو، سیستەمی کۆنتینێنتاڵ کۆدەکاتەوە، لەم سیستەمەدا پزیشکی دادیی مردووان هەمان پزیشکی زیندوانە، بەڵام هەندێك دەسەڵاتی یاسایی هەیەو، مەبەستی سەرەکیی ئەم سیستەمە ئاشکراکردنی تاوانەکەو، هۆی مردنەکەیە .

## تەوەری دووەم: پزیشکیی دادیی لە عێراقدا:

### لقی یەکەم: سەربوردەیەکی پزیشکیی دادیی لە عێراقدا: (١٦).

أ - سالّی ١٩١٨ز یەکەم تاقیگەی ناوەندیی بۆ کیمیاو، پاسۆلۆجیو، بەکتریۆلۆجی لە بەغدا کرایەوە. سالّی ١٩١٩ز بەشێکی تێدا کرایەوە بۆ پشکنینی سامپلّی پزیشکیی دادیی.

ب – لە سالّی ١٩٢٠ز بە هۆی پزیشکێکی بەریتانی یەوە (سەندەرسن پاشا)و، بە یارمەتی پزیشکێکی عێراقی (ئاکۆب جۆپانیان) دەستکرا بە پشکنینی تەرم، ئەو دامەزراوەش سەربە فەرمانگەی تەندروستی بوو، فەرمانگەکەش سەر بە وەزارەتی پەروەردەو تەندروستی بوو.

ج – لە سالّی ١٩٢١ز لە عێراقدا یەکەم وەزارەت بۆ تەندروستی کرایەوەو، یەکەم وەزیریش د.حەننا خەیات بوو، کە مامۆستای پزیشکیی دادیی بوو لە کۆلیژی ماف (یاسا).

د – لە سالّی ١٩٢٢ز وەزارەتی تەندروستی هەلّوەشێنرایەوەو، کرا بە بەڕێوەبەرایەتیەکو، خرایە سەر وەزارەتی ناوخۆ.

هـ – سالّی ١٩٢٨ز لە نزیك تاقیگەی ناوەندیی بینایەکی بچوك کرایەوە، بۆ ئەوەی بکرێتە کلینکی دەرەکیی نەخۆشخانەی پاشایەتیو، بەشێکیشی تایبەت کرا بۆ پزیشکیی دادیی.

و – سالّی ١٩٣٢ز د. أحمد عزت القیسی لە فەرەنسا گەڕایەوە، یەکەم پزیشکی پسپۆڕ بوو لە پزیشکیی دادییو، نەخۆشیە نیرۆلۆجیەکان (مێشكودەمار).

ز – سالّی ١٩٣٥ز د. وصفی محمد علی وەك یاریدەدەری د. أحمد عزت القیسی دانرا.

ح – سالّی ١٩٣٨ز یەکەم تاقیگەی پزیشکیی دادیی فەرمیی کرایەوە.

**گ – ساڵی ١٩٣٩ز پزیشکیی دادیی لە نەخۆشخانەی پاشایەتی جیاکرایەوەو، ڕاستەوخۆ خرایە سەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستیو، ناونرا پەیمانگەی پزیشکیی دادیی.**

**ی – ساڵی ١٩٤٠ز بەڕێوەبەرایەتی گشتیی تەندروستی لە وەزارەتی ناوخۆ جیاکرایەوەو، بەسترا بە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی یەوە..**

**ك – ساڵی ١٩٤١ز بینای ئێستای پەیمانگەی پزیشکیی دادیی کرایەوە، بەڵام دواتر نۆژەن کراوەتەوەو، فراوان کراوە.**

**ل – ساڵی ١٩٥٢ز وەزارەتی تەندروستی دامەزرا.**

**م – ساڵی ١٩٧٨ز بە بڕیارێك پەیمانگەکە خرایە سەر وەزارەتی دادو، لە ١/١/١٩٧٩ز بڕیارەکە جێ بەجێ کرا.**

**ن – لە ساڵەکانی هەشتاکاندا پەیمانگە خرایەوە سەر وەزارەتی تەندروستی.**

### لقی دووەم: مێژووی بەشی پزیشکیی دادیی لە کۆلێژی پزیشکیی بەغدا:

**لە ساڵی ١٩٢٧ زاینی کۆلێژی پزیشکی لە بەغدا دامەزرا، لە یەکەم خولی کۆلێژەکەدا وانەی پزیشکیی دادیی خوێنرا، دوای د. سەندرسن پاشای بەریتانی کە پزیشکی خێزانیی پاشایەتیو، یەکەم ڕاگری کۆلێژەکەش بوو، د.حنا خیات یەکەم مامۆستای تیۆریی بابەتەکە بوو، لە هەمان کاتدا یەکەم ڕاگری عێراقی کۆلێژەکەش بوو، د.حەننا یەکەم وەزیری تەندروستی بوو لە عێراقداو، یەکەم عێراقی بوو کتێبی لە سەر پزیشکیی دادیی نوسی بە ناونیشانی ﴿الدليل في مسالك الطب القانوني﴾، ساڵی ١٩٢٥ یەکەم چاپی دەرچوو. د.ئاکۆب جوپانیان لایەنی پراکتیکی توێکاریی دەوتەوە، هەردوو پزیشکەکە پسپۆڕ نەبون لە پزیشکیی دادیی دا. ساڵی ١٩٣٢ز د.أحمد عزت القيسي گەڕایەوە بۆ عێراق، یەکەم پزیشکی عێراقی بوو بڕوانامەی پسپۆڕیی لە پزیشکیی دادییدا هەبوو. پەیمانگەی پزیشکیی دادییو، بەشی پزیشکیی دادیی لە کۆلێژی پزیشکیی (بەغدا) دامەزراند. کە ئەوکات سەر بە لقی تەندروستی گشتی بوو. پاشان خرایە سەر بەشی (پاسۆلۆجی) نەخۆشیزانیو، هەتا**

ئیستاش سەر بەو بەشەیە. پاش کۆچی دوایی د.احمد، د.چیاو نوری حسن الموسوی وانەکەی دەوتەوە، مەخابن ساڵی ۱۹۸٥ز بە ژەهراویکردن کوژرا. لە دوای ئەو کۆمەڵێك پزیشکی پەیمانگای پزیشکیی دادیی لەگەڵ د.گریف سرحان الغریری کە مامۆستای وانەکە بوو لە کۆلیژی پزیشکیی زانکۆی مستنصریە وانەکەیان وتەوە. د. وصفی محمد علی یەکێك لە کەسە دیارەکانی پزشکی دادیی عێراقو جیهانی عەرەبی یە، ساڵی ۱۹۳٥ کۆلیژی پزیشکی بەغدای تەواوکردو، بوو بە یاریدەدەری د. احمد عزت القیسی، ساڵی ۱۹٤٤ دیبلۆمی پزیشکی دادیی لە زانکۆی قاهیرە بەدەست هێنا، لە شارەکانی ئەدنبەرەو لەندەنی بەریتانیا مومارسەی پزیشکی دادیی کردووە، لە کۆلیژی پزیشکی بەغداو ئەکادیمیەی پۆلیس وانەی وتووەتەوەو، بووە بە بەرپرسی پەیمانگاو، زیاتر لە نیو سەدە خزمەتی ئەم بوارەی کردوە، چەندین نوسراوی لە بواری پزیشکی دادیدا نوسیوە، لەوانە : **(الوجیز فی الطب العدلی، و الطب العدلی علماً و تطبیقاً).**

### لقی سێیەم: سیستەمی پزیشکیی دادیی لە عێراقدا:

سیستەمێکە هاوشێوەی سیستەمی کۆنتینێنتاڵەو، بەپێی گونجاندنی لە گەڵ نەریتو، یاسای وڵاتدا گۆڕانکاری تێدا کراوە، هەمان پزیشك پشکنینی کەیسەکانی مردوو زیندو دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی پەرتەوازەبونی هەوڵەکانو، هەردوو لایەنی دادوەریو، لێکۆڵینەوەو، پزیشکیی دادیی لە یەکتر دابڕاون، لایەنی دادوەرییو لێکۆڵینەوە بڕیار دەدات بە هەواڵەکردنی کەیسەکان بۆ پزیشکیی دادییو، ئەویش لایەنی جێبەجێ کارە، مەبەستی بنەڕەتی لێی دۆزینەوەی تاوانەکەو پاشان زانینی هۆی مردنەکەیە، بە هۆی لایەنی کۆمەڵایەتیو، ئابوریەوە کادیری پزیشکیی دادیی لە عێراقدا کەمن. فەرمانگەی پزیشکیی دادیی عێراقی لە بەغدا سەنتەری سەرەکیی کارەکانی پزیشکیی دادییە لە بەغداو عێراقداو، ئێستا پەیوەستە بە وەزارەتی تەندروستیەوە. (۱۷).

## لقی چوارەم: پێکهاتەی پزیشکیی دادیی لە عێراقدا: (١٨).

یاسای پزیشکیی دادیی ژمارە "٣٧"ی ساڵی٢٠١٣، پێکهاتەو ئەرکی پزیشکیی دادیی دیاری کردوە، بەم شێوە:

**یەکەم:** فەرمانگەیەك دادەمەزرێت پێی دەوترێ " فەرمانگەی پزیشکی دادیی " بارەگاکەی لە بەغدا دەسبێتو، پەیوەستە بە وەزارەتی تەندروستیەوەو، کەسایەتی مەعنەوی هەیەو، بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی پزیشکی دادیی نوێنەرایەتی دەکات. ماددەی/ ١-یەکەم.

**دووەم:** بەشەکانی پزیشکی دادیی لە سەنتەری پارێزگاکان دادەمەزرێنو، لە لایەنی کارگێڕیەوە سەر بە فەرمانگەی تەندروستی پارێزگاکانن (نوسینگەی بەڕێوەبەری گشتی)و، لە لایەنی هونەریشەوە سەر بە فەرمانگەی پزیشکی دادیی بەغدان. م/ ١-دووەم.

**سێیەم:** وەزارەتی بەرگری بۆی هەیە پزیشکاریی دادیی تایبەت بەخۆی بکاتەوەو، پزیشکێکی دادیی سەرۆکایەتی بکاتو، بە پێی ڕێنمایەکانو دیسپلینەکانی پزیشکی دادییو، لەسەر ئامۆژگاریەکانی وەزیری بەرگری کاروباری ڕێك بخات. م/ ١-سێیەم.

**خاڵی یەکەم: پێکهاتەی پزیشکی دادیی بەم شێوەیە: م/ ٩**

یەکەم: فەرمانگەی پزیشکی دادیی لە بەغدا لەمانە پێکدێت:

أ – ئەنجومەنی فەرمانگەی پزیشکی دادیی

ب – بەشەکانی فەرمانگەی پزیشکی دادیی.

**دووەم:** بەشەکانی پزیشکی دادیی لە سەنتەری پارێزگاکان.

**سێیەم:** پزیشکیە دادییەکانی سەر بە وەزارەتی بەرگری.

**خاڵی دووەم: ئەنجومەنی فەرمانگەی پزیشکی دادیی لەمانە پێکدێت:**

**أ – بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی پزیشکی دادیی. سەرۆکە.**

**ب – ئەمانەش ئەندامی ئەنجومەنن:**

**١ – نوێنەری وەزارەتی بەرگری، پزیشکێکی دادیی دەبێت، لە وەزارەتی بەرگری کار بکات.**

**٢ – نوێنەری وەزارەتی ناوخۆ، ئەفسەرێکی پۆلیسی مافپەروەر دەبێت، پلەی لە موقەدەم کەمتر نەبێت و، بڕوانامەی لە بەکالۆریۆس کەمتر نەبێت لە یاسادا.**

**٣ – نوێنەری وەزارەتی خوێندنی باڵا، مامۆستای بابەتی پزیشکیی دادیی بێت لە زانکۆکان.**

**٤ – نوێنەری ئەنجومەنی باڵای دادوەریی، دادوەرێکی پلە دووەم بێت.**

**٥ – بەڕێوەبەری پەیمانگای پزیشکی دادیی لە پارێزگاکان.**

**٦ – سەرۆک بەشەکانی فەرمانگەی پزیشکیی دادیی.**

**٧ – دەزگای شەهیدان، بەڕێوەبەری سەنتەری نیشتمانیی بۆ دیکۆمێنتکردنی تاوانەکانی بەعس نوێنەرایەتی دەکات.**

**٨ – نوێنەری وەزارەتی مافی مرۆڤ بە پلەی بەڕێوەبەر، وەزیر هەڵیدەبژێرێ.**

**٩ – نوێنەری وەزارەتی داد بە پلەی بەڕێوەبەر، وەزیر هەڵیدەبژێرێ.**

**١٠ – نوێنەری وەزارەتی ژینگە بە پلەی بەڕێوەبەر، وەزیر هەڵیدەبژێرێ.**

**١١– نوێنەری ئەمینداریێتی بەغدا، بەڕێوەبەری بەشی کاروباری گۆڕستانەکان نوێنەرایەتی دەکات.**

١٢ – دوو پزیشکی دادیی، وەزیری تەندروستی هەرێمی کوردستان ناویان دیاری دەکات. م/١٠ یەکەم.

**خاڵی سێیەم: بەشەکانی فەرمانگەی پزیشکی دادیی لەم بەشانە پێکدێن:**

١ – بەشی پشکنینی زیندوەکان.

٢ – بەشی پشکنینی مردووەکان.

٣ – بەشی تاقیگە.

٤ - بەشی پشکنینی مۆری ترشی ناوکی (D.N.A).

٥ – بەشی تیشک.

٦ – بەشی پلانو ئامارو لێکۆڵینەوەو ڕاهێنان.

٧ - بەشی ونبووەکان.

٨ - بەشی گۆڕە بەکۆمەڵەکان.

٩ - بەشی ئەندازەو، پارێزگاریی‌وچاککردنەوە.

١٠ - بەشی کارگێڕیو، داراییو، یاسایی. م/١٤.

**خاڵی چوارەم: کێ پزیشکی دادیی یە ؟**

بە پێی ماددەی (٤)ی یاسای پزیشکیی دادیی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣، ئەمانەی خوارەوە بە پزیشکی دادیی ئەژمار دەکرێن:

١ – هەر پزیشکێك ناونیشانەکەی پسپۆڕ بێت لە پزیشکیی دادیی دا.

٢ – هەر پزیشکێك بە سەرکەوتوویی خولێکی ڕاهێنانی لە پەیمانگەی پزیشکیدا تەواوکردبێت، ماوەکەی لە ساڵێك کەمتر نەبێت.

٣ – هەر پزیشکێك بۆ ماوەی دوو ساڵ بە بەردەوامیی ڕاهێنان (ممارسە)ی هەبێت لە ژێر چاودێری پزیشکێکی دادییو، لە تاقیکردنەوەی " ئەزمونی فەرمانگەی پزیشکی دادیی" سەرکەوتوو بێت.

**خاڵی پێنجەم: پزیشکی دادیی ئەم کارانە ئەنجام دەدات:**

بە پێی بڕگەی یەکەمی ماددەی (٥) ئەم کارانە دەکات.

أ – پشکنینی پێکراوەکان، بۆ دیاریکردنی پێکانەکەو هۆکارەکەی.

ب – توێکاریی تەرمو پشکنینی ئێسك بۆ دیاریکردنی شوناسەکەیو، هۆی مردنەکەی.

ج – ئامادەبوونی پرۆسەی هەڵدانەوەی گۆڕو، سەیرکردنو توێکاری کردنی بۆ ئاشکراکردنی هۆی مردنەکەی و، گرتنە بەری هەر ڕێکارێکی تر دادوەری لێکۆڵینەوە داوای بکات.

د – دەربڕینی ڕای هونەریی لەو ڕوداوە پزیشکیانەی دەخرێنە بەردەم دادوەریی.

ه – خەملاندنی تەمەنو، دیاریکردنی ڕەگەز لەسەر داوای دادگا، یاخود داوای لایەنێکی فەرمی تایبەتمەند.

و – نۆڕینو سەیرکردنی ڕوداوەکە لە جێگای ڕودانەکەدا لە کاتی پێویستدا.

ز – پشکنینی ئەو ڕوداوانەی لە تاوانی دژ بە ڕەوشتو ڕەویەی گشتی دەکەونەوە.

ح – پشکنینی سپێرم و خوێنو، دیاریکردنی گروپەکانیان.

گ – پشکنینی قژو موو، دیاریکردنی سەرچاوەکەی.

ی – شیکاری سامپڵە جۆربەجۆرەکانی وەك: ماددەی هۆشبەرو ژەهرەکانو پاشماوەی باروتو دەردراوەکانی لاشە.

ك – پشكنینی سامپڵی شانە جیاوازەكان، بۆ زانینی سروشتو سەرچاوەكانیان.

ل ئەنجامدانی پشكنینی ترشی ناوكیی، (D.N.A).

**لقی پێنجەم: لیژنە پزیشكییەكان:**

**یەكەم: لیژنە پزیشكیەكان چیین ؟ (١٩).**

هەموو لیژنە پزیشكییەكان بەشێكن لە پزیشكیی دادیی، چونكە ئەو كارە پزیشكییانە رادەپەڕێنن كە پەیوەندی بە یاساوە هەیە، واتە: لیژنەكان ڕاوبۆچونی خۆیان لە بارەی كەیسەكانەوە دیاری دەكەنو، بە ڕاپۆرتێك وەڵامی لایەنی پەیوەندیدار دەدەنەوەو، لایەنی مەبەستیش لەبەر ڕۆشنایی ڕاپۆرتی لیژنە پزیشكیەكانو، بەپێی یاسا كاری پێویست ئەنجام دەدات. ڕێنماییەكانی وەزارەتی تەندروستی ئەوە ئاشكرا دەكات لیژنە پزیشكیەكان بەشێكن لە پزیشكیی دادیی، ڕێنماییەكان كە لە ژمارە (٣٥٥٠)ی الوقائع العراقیە لە ١٩٩٥/٢/١٧دا بلاّو كراوەتەوە، دەڵێ: ﴿ئەو لیژنە پزیشكیانەی لە پارێزگاكان پێكهێنراون، پشكنین بۆ ئەو كەیسە پزیشكییە دادییە دەكەن كە لەلایەن دەزگا تەندروستیەكانەوە بۆیان هەواڵە دەكرێ...﴾.

**دووەم: پێكهێنانی لیژنە پزیشكیەكان: (٢٠).**

لیژنەی پزیشكیی بە پێشنیار كردنی فەرمانگەی تەندروستی لە پارێزگاو، بە ڕەزامەندی وەزیری تەندروستی پێكدەهێنرێ. پاش ڕەزامەندی وەزیر لەسەر پێكهێنانی لیژنەی پزیشكیی، ئەركی دەركردنی فەرمانی كارگێڕی لە ئەستۆی فەرمانگە تەندروستییەكانە لە پارێزگاكان. بە پێی بڕگەكانی (أ-ب)ی ماددەی یەكی ڕێنمایی لیژنە پزیشكیەكانی ساڵی ١٩٩٥ كە لە ژمارە (٣٥٥٠) الوقائع العراقیەدا بلاّو كراوەتەوە، لیژنە پزیشكیەكان ئەمانەن:-

١ – لیژنەی پزیشكیی سەرەتایی. لە شەش پزیشك پێكدێت.

٢– لیژنەی پزیشکیی خەملاندنی لەکارکەوتن و پەککەوتەیی. له شەش پزیشک پێکدێت.

٣ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بەو کەسانەی سەر بە وەزارەتی پەروەردەو خویندنی بالاو توێژینەوەی زانستین. له پێنج پزیشك پێکدێت.

٤ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بە داواکارانی دامەزراندن و مۆڵەتی شۆفێری. له سێ پزیشك پێکدێت.

٥ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بە پێدانی مۆڵەتی شۆفێری بە کەڕو لاڵ. له سێ پزیشك پێکدێت.

٦ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بە پشکنینی نەخۆشی سیل. له سێ پزیشك پێکدێت.

٧ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بە هەواڵەکردن بۆ سەنتەری نەشتەرگەری دڵ. له سێ پزیشك پێکدێت.

٨ – لیژنەی پزیشکیی تایبەت بە داواکارانی هەلگرتنی چەك. له سێ پزیشك پێکدێت.

٩ – لیژنەی پشکنین و دەستنیشان کردنی خوێندکارانی پۆلە پەروەردەییە تایبەتەکان. له پێنج پزیشك پێکدێت.

١٠ – لیژنەی پزیشکیی سەرەتایی دەروون و دەمار. له سێ پزیشك پێکدێت.

١١ – لیژنەی پزیشکیی دەروونی و دادیی. له چوار پزیشك پێکدێت.

١٢ – لیژنەی پزیشکیی هونەریی. له چوار پزیشك و، دوو توێژەری کۆمەلایەتی و، دوو توێژەری دەروونیی پێکدێت.

١٣ – لیژنەی پزیشکیی ڕاسپاردە کردن بە ناردنی نەخۆش بۆ چارەسەرکردن لە دەرەوەی عێراق لەسەر خەرجی خۆی. لە پێنج پزیشك پێکدێت.

١٤ – لیژنەی پزیشکیی تێهەڵچوونەوە: دوو لیژنەن:

أ– لیژنەی پزیشکیی تێهەڵچوونەوەی گشتی. لە شەش پزیشك پێکدێت.

ب – لیژنەی پزیشکیی تێهەڵچوونەوەی دەروونیی‌و دەماریی. لە چوار پزیشك پێکدێت.

**سێیەم: ئەرکی لیژنە پزیشکییەکان: (٢١).**

(ئەو لیژنە پزیشکیانەی لە سەنتەری پارێزگاکاندا پێکهێنراون پشکنین دەکەن بۆ ئەو ڕووداوە پزیشکییە دادییانەی لە لایەن پزیشکانی دەزگا تەندروستیەکانەوە لە سنوری پارێزگادا بە پێی ئەم ڕێنماییەکان، یان لەبەر هەر گرانیو ئاستەنگێك دێتە ڕێیان هەواڵەی دەکەن، یان لەلایەن دەسەلاتی لێکۆڵینەوە، یا دادوەرییەوە هەواڵە دەکرێن. هەرکات ئەو لیژنانە ئاستەنگێکیان هاتە ڕێ ، بۆ بەرچاو ڕوونی لە کارەکەیاندا دەبێت ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکەن بە لایەنێکی باڵاتر لە سەنتەری پارێزگادا، یان پەیمانگای پزیشکیی دادییەوە. کەیسەکە یان سەمپڵێکی تایبەت ڕەوانەی پزیشکیی دادیی بکەن، دەبێت لەگەڵ داواکاریەکاندا هەموو زانیارییە بەردەستەکانو، بارودۆخی کێشەکەو، وێنەیەکی (ئۆرجیناڵ) بنەڕەتی داواکاریە پێشکەش کراوەکە بۆ پشکنین، لەگەڵ تێبینیە تۆمارکراوەکانی پزیشك و، جۆری ئەو ئاستەنگەی ڕوو بە ڕووی لیژنەکە بووەتەوە هاوپێچ بکرێن. دەبێت پرسیاری ڕوون ئاراستە بکرێ، تا پەیمانگا وەڵام بداتەوەو، لایەنی مەبەست لە ئەنجامەکە ئاگادار بکاتەوە.).

سەرەڕای ئەوەی سەرەوە لیژنە پزیشکیەکان بە پێی برگەی یەکەمی ماددەی (٩٤)ی یاسای ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ یاسای تەندروستی گشتی بە شێوەیەکی گشتی ئەم کارانە ئەنجام دەدەن:- (٢٢).

١ – پشکنینی ئەوانەی پاڵێوراون بۆ خزمەتکردن لە فەرمانگەکانی میریدا.

٢ – هەواڵەکردنی فەرمانبەرو کرێکار بۆ خانەنشینیو، دیاریکردنی ڕادەی شیاویان بۆ خزمەتکردن.

٣ – خەملاندنی پلەی لەکارکەوتنو پەککەوتن.

٤ – چارەسەری پزیشکیی لە دەرەوەی وڵات.

٥ – دیراسەکردنی ئەو ڕاپۆرتە پزیشکیانەی لە دەرەوەی وڵات نوسراون، بەمەبەستی پشتگیری کردن، یان وەرنەگرتنو. پەرچدانەوەیان.

٦ – دیاریکردنی باری تەندروستیو دەروونیو ژیریی ئەو کەسانەی لە لایەنە فەرمیەکانەوە بۆیان ڕەوانە دەکرێ .

٧ – پشکنینی داواکاری مۆڵەتی شۆفێریو، تازەکردنەوەی مۆڵەتی شۆفێری.

٨ – پشکنینی ئەو خوێندکارانەی کە دەڕۆنە کۆلیژو پەیمانگاکان.

٩ – بۆ هەر مەبەستێکی دیکە بە پێی پێویست.

**چوارەم: سەرنجێك لەسەر لیژنە پزیشکیەکان:**

**یەکەم:** لیژنە پزیشکیەکان یەکێکن لە بەشەکانی پزیشکی دادییو، خزمەتێکی بەرچاو بە پاراستنی مافی تاكو کۆمەڵگەو دەزگا فەرمیو نافەرمیەکان دەکەن، لە بواری تاکدا دیاریکردنی ڕادەی پەککەوتنو باری تەندروستیو دیاریکردنی تەمەنی. لە بواری کۆمەڵگەدا ڕێگرتن لەو کەسانەی شیاویی دەروونیو جەستەییان ڕێگا نادات ئەو کارانە بکەن کە لەوانەیە زیان بە خەڵکان بگەیەنن، وەك پێدانی مۆڵەتی شۆفێریو چەك هەلگرتنو هەر کارێکی دیکە کەسەکە شیاوی نەبێت، یان پەرچدانەوەی داواکاری ئەو کەسانە دەیانەوێ لە ڕێی فێڵ کردنەوە لە دەزگا فەرمیو نافەرمیەکان سودمەند بن.

**دووەم: تێبینی لەسەر کاری لیژنە پزیشکیەکان:**

**١ – لیژنە پزیشکیەکان بەشێکن لە پزیشکی دادیی، لەبەر ئەوەی وەك سەربەخۆ کار دەکەن، ئەمە ڕۆڵی پزیشکی دادیی لاواز دەکات.**

**٢ – هەندێك جار ڕۆتین بە کارەکانەوە دبینرێ، بە تایبەت لە لیژنە دەروونیەکانو، لە گواستنەوەی خوێندکاری زانکۆو پەیمانگاکان بۆ شوێنێکی نزیك لە شوێنی نیشتەجێبوونیان، ڕاپۆرتێکی بۆ دەنوسرێ نەخۆشی سایکۆلۆجی هەیە!**

**٣ – پشکنینی چاوو گروپی خوێن بە تەنیا بۆ وەرگرتن لە زانکۆو پەیمانگاکان وا ئەزانین بایەخێکی زانستی ئەوتۆیان نییەو، بوونو نەبوونی زۆر جیاواز نین.**

# تەوەری سێیەم: پزیشکی دادیی لە هەرێمی کوردستان/ عێراق

سیستەمی پزیشکیی دادیی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا هەمان سیستەمی عێراقە بەبێ جیاوازیی، چونکە هەرێم بەشێکە لە عێراق، کاروباری ئەم بەشە بە یاسای پزیشکی دادیی هەرێمی کوردستان/ عێراقی ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠١ ڕێکخراوە، کە دەقاو دەق یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٨٧ی عێراقی یە، ئەم یاسایە تا ساڵی ٢٠١٣ کاری پێکراوە. پاش دەرچوونی یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣ی عێراقی، ئێستا ئەم یاسایە لە هەرێمی کوردستانیشدا بەر کارە.

## لقی یەکەم: پێکهاتەی پزیشکی دادیی لە هەرێمی کوردستاندا:

بە پێی یاسای پزیشکی دادیی هەرێمی کوردستان/عێراقی ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠١ کە دەقی یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٥٧)ی ساڵی (١٩٨٧)ە، بەم شێوازەیە.

**یەکەم: پێکهاتەی پزیشکی دادیی بەم شێوەیە.**

م/٤: بە پێی ئەم یاسایە پەیمانگەی پزیشکی دادەمەزرێت‌و، بارەگاکەی لە هەولێر دەبێت‌و، پەیوەستە بە وەزارەتەوە. (بە پێی یاسای ژمارە ٣٧ی ساڵی ٢٠١٣ پەیمانگە کراوە بە فەرمانگەی پزیشکی دادیی).

م/٥: یەکەم/ پەیمانگەی پزیشکی دادیی پێکدێت لە :

أ/ ئەنجومەنی پەیمانگا.

ب/ بەشەکانی پەیمانگا.

م/٥: دووەم/ پزیشککاریە دادیەکان لە سەنتەری پارێزگاکان لە ڕووی کارگێڕیەوە سەر بە فەرمانگە تەندروستیەکانن لە پارێزگاکان‌و، لە ڕووی هونەریشەوە سەر بە پەیمانگان.

م/٦ : وەزیر بۆی هەیە لە هەر پارێزگایەك زانكۆی تێدا بێت، بە پێی پێویست پەیمانگای پزیشكی دادیی تێدا بكاتەوە بە ئاستی بەڕێوەبەرایەتی.

م/٧ : یەكەم/ ئەنجومەنی پەیمانگا لەم بەشانە پێكدێت:

١/ بەڕێوەبەری پەیمانگا، سەرۆكی ئەنجومەنە.

٢/ نوێنەری وەزارەتی پێشمەرگە، پزیشكێكی سەربازی دەبێت.

٣/ نوێنەری وەزارەتی ناوخۆ، ئەفسەرێكی پۆلیس دەبێت، پلەكەی لە موقەدەم كەمتر نەبێتو، بڕوانامەی لە بەكالۆریۆس كەمتر نەبێت لە یاسادا.

٤/ نوێنەری وەزارەتی خوێندنی باڵا، مامۆستای بابەتی پزیشكی دادیی بێت لە زانكۆكان.

٥/ دادوەرێك پلەكەی لە پلەی دووەم كەمتر نەبێت، وەزیری داد هەڵی دەبژێرێ.

٦/ داواكارێكی گشتی، پلەكەی لە پلەی دووەم كەمتر نەبێت، وەزیری داد هەڵی دەبژێرێ.

٧/ سەرۆك بەشەكانی پەیمانگای پزیشكی.

٨/ سێ پزیشكی دادیی وەزیری تەندروستی هەڵیان دەبژێرێ.

٩/ پزیشكێكی پسپۆڕ، وەزیر هەڵی دەبژێرێ بۆ ماوەی دوو ساڵ، دەكرێ تازەش بكرێتەوە.

دووەم: بەشەكانی پەیمانگە

م/١١ پەیمانگا لەم بەشانە پێكدێت:

١/ بەشی پشكنینی زیندووان، پزیشكێكی دادیی سەرپەرشتی دەكات.

٢/ بەشی پشکنینی مردووان، پزیشکێکی دادیی سەرپەرشتی دەکات.

٣/ بەشی تاقیگە.

٤/ بەشی تیشك پزیشکێکی پسپۆڕ سەرپەرشتی دەکات.

٥/ بەشی ئامارو توێژینەوە.

**سێیەم: پزیشکی دادیی کێیە؟**

م١٤/ هەریەك لەمانەی خوارەوە بە پزیشکی دادیی دادەنرێن:

١/ هەر پزیشکێك ناونیشانەکەی پسپۆڕ بێت لە پزیشکی دادییدا.

٢/ هەر پزیشکێك بە بەردەوامی ڕاهێنان (مومارەسە)ی هەبێت لە پزیشکی دادییدا بۆ ماوەیەك، لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت.

٣/ هەر پزیشکێك بە سەرکەوتوویی خولێکی ڕاهێنانی لە پەیمانگەی پزیشکیدا بڕیبێت، ماوەکەی لە ساڵێك کەمتر نەبێت.

**چوارەم: پزیشکی دادیی ئەم کارانە ئەنجام دەدات:**

بە پێی بڕگەی یەکەمی ماددەی (١٥) ئەم کارانە دەکات.

**هەمان ئەو کارانەیە کە لە یاسای ژمارە (٣٧)ی ٢٠١٣دا دیاری کراوە، بێجگە لە پشکنینی (D.N.A) لەم یاسایەدا ئاماژەی پێ نەکراوە، چونکە لەو سەردەمەدا بە کار نەهاتووە.**

**سەرنجێك لە هەردوو یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٥٧)ی ١٩٨٧و، ژمارە(٣٧)ی ٢٠١٣.**

هەموار کردنو دەرچواندنی یاسایەك پەیوەستە بە گۆڕانکاری سیاسی، یان کۆمەلایەتی، یان ئابوری، یان زانستیی. بە سەرنجدان لە جیاوازیەکانی هەردوو یاسای پزیشکی دادیی ژمارە

(٥٧)ی ١٩٨٧و، ژمارە (٣٧)ی ٢٠١٣. هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی سەرەوە ڕویان داوە. سیستەمی سیاسی گۆڕاوەو، کۆمەڵێك ئاسەواری لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە. باری کۆمەڵایەتیش گۆڕاوەو، کۆمەڵگەی عێراقیش بووەتە سوتەمەنی ئەو گۆڕانکاریە سیاسیو کۆمەڵایەتیە، باری ئابوریش گۆڕاوەو، ئاستی زانستیش بەرەو پێشەوە ڕۆشتووە، بە تایبەت بەکارهێنانی مۆری بۆماوەیی (D.N.A) لە پشکنینەکانی پزیشکی دادیدا.

١ - بارودۆخی سیاسی لە کاتی دانانی یاسای یەکەمدا، عێراق وڵاتێکی دیکتاتۆریی، تاك حزبی بوو، هەموو جومگەکان لە ژێر دەستی خۆیدابوو، تیرۆری سیاسیو گۆڕی بە کۆمەڵ خۆی ئەنجامی دەدا.

٢ – لە یاسای دووەمدا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ڕای کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی وەزارەتێك دانرا بە ناوی وەزارەتی مافی مرۆڤ، بۆیە لە یاسا تازەکەدا نوێنەری مافی مرۆڤیش کرا بە ئەندامی ئەنجومەنی پەیمانگای پزیشکی دادیی، ئەمە لە خۆیدا کارێکی باشە، چونکە لە کاتی سەلماندنی بوونی ئەشکەنجەداندا دەتوانرێت لە ڕووی یاساییەوە هیچ بایەخێك دانەنرێت بۆ ئەو دان پیانانەی بە زۆر وەرگیراون، بۆ دۆزینەوەی بێسەروشوێنەکانو، بۆ دەرخستنی تاوانەکانی بەعس بەشێکیش بە ناوی گۆڕە بەکۆمەڵەکان دروست کرا.

٣ - نوێنەری دەزگای شەهیدانو ژینگەش کران بە ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکی دادیی.

٤ - وەزارەتی بەرگریش ڕێی پێدرا پزیشکی دادیی تایبەت بە خۆی بکاتەوە.

٥ - یاسای دووەم کاتێك دانرا عێراق بوو بە وڵاتێکی فیدراڵیو، پارێزگاکان دەستەڵاتی زیاتریان پێدراو، لە هەموو پارێزگاکاندا زانکۆو کۆلیژی پزیشکی کرایەوە، بە هۆی شەڕی ناوخۆو تیرۆری ئەتنیکیو تائیفیەوە دەیان هەزار هاوڵاتی بوون بە قوربانی. ئەوەش ئەرکی پزیشکیە دادییەکانی گرانتر کرد، بەو هۆیەوە ئاستی پزیشکی دادیی لە پەیمانگا بەرز کرایەوە بۆ فەرمانگەو، لە پارێزگاکانیشدا کران بە پەیمانگا.

٦ - لە یاسا نوێکەدا ماوەی مومارەسە کردنی پزیشك بۆ ئەوەی ناوی پزیشکی دادیی پێبدرێت کراوە بە دووساڵ، وا دەزانین ئەمەش کارێکی باشە، چونکە پزیشکێکی گشتی شارەزاییەکی تەواوی لە بارەی پێکهاتەی لاشەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە دوو ساڵ بەسە بۆ ئەوەی لێزانینی تەواو لە بوارەکەدا بەدەست بهێنێت، لە هەمان کاتدا لە زۆربەی قەزاکاندا پزیشکاری دادیی کراوەتەوە، ئەوەش پێویستی بە پێگەیاندنی پزیشکی دادیی هەیە.

٧ - بەشەکانی پزیشکی دادیی لە پێنج بەشەوە کران بە دە بەش، هەندێك لەو بەشانەش لەبەر پێویستبوونی بوو وەك بەشی گۆڕە بەکۆمەڵەکان و بێسەروشوێنەکان، هەندێکیشی بە هۆی پێشکەوتنی زانستی بوو لە بواری ناسینەوەدا، وەك بەشی مۆری ترشی ناوکیی (D.N.A).

لە کۆتاییدا دەڵێین یاسا نوێکە پێشکەوتوترە، بەڵام ئەوەی لە واقیعی دەزگاکانی پزیشکی دادییدا بۆی دەزانێت ئەم بوارە چەندە پێویستی بە بایەخ پێدانە. بە دەرچونی یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣ کار بەم یاسایە دەکرێتو، ئێستا یاسای بەرکارە لە عێراقو هەرێمی کوردستانیشدا.

### لقی دووەم: پزیشکیی دادیی لە سلێمانیدا:

سەبارەت بە مێژووی پزیشکیی دادیی لە شاری سلێمانی بە گوێرەی ئەو بەرایانەی کە لە ئەرشیفی پەیمانگای پزیشکی دادیی سلێمانیدا ماوەتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٠ کە وەك کەیسی پزیشکی دادیی مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو، چەند پزیشکێك توێکاریو شیکاریی پزیشکییان تێدا ئەنجامداوە، لەوانە: ( د. خلیل جواد، د. صاحب الامیر، د. گیڤی دزازرا میرزە، د. دارا احمد تەوفیق). ئەمانە ناویان لە ڕاپۆرتەکاندا هاتووە، پاشان ڕاپۆرتەکان لە لایەن سەرۆکی تەندروستی سلێمانی ئەو کاتەوە (د. عبدالرحمن رئیس) واژۆ کراونو، پاشان ئاراستەی لایەنی لێکۆڵینەوە کراوە. ئەم شێوازە کارکردنە تا سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوی خایاندوە. پاشان ( د.عبدالرحمن رئیس)یش وەك پزیشکێك کاری پزیشکی دادیی ئەنجامداوە، ئەمەش تا ساڵەکانی هەشتاکان بەردەوام بووە. پاشان ئەو

ئەرکە خراوەتە ئەستۆی پزیشکی نەشتەرکاری ئێشکگر. واتە: ئەو پزیشکە نەشتەرکارەی کە لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن ئێشکگریی هەبوو، لە هەمان کاتدا ئەرکی ئەنجامدانی کاری پزیشکی دادیشی پێسپێردرابوو، ئەم شێوە کارکردنەش تا ساڵەکانی کۆتایی نەوەدەکان بەردەوام بوو. لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠) پشەوە بەشەکە سپێردرا بە نەشتەرکاری پسپۆڕ (د. محمد نوری)و، کرا بە بەشێك لە نەخۆشخانەی نەشتەرگەریی فێرکاریی، ئەم شێوە کارکردنەش تا ساڵی ٢٠٠٢ بەردەوام بوو. سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ (د. بەرزان دارتاش) وەك (مقیم اقدم)ی بوارەکەو، لە هەمان کاتدا خوێندکاری دیبلۆمی باڵای پزیشکی دادیی دەست بەکار بوو، ساڵی ٢٠٠٤ بڕوانامەی دبلۆمی باڵای پزیشکی دادوەریی بەدەستهێنا، ئەمەش بە دەستپێکی یەکەم پسپۆڕیی بوارەکە ئەژمار دەکرێت لە سلێمانی. ساڵی ٢٠٠٥ لە وڵاتی بەریتانیا لە زانکۆی بۆرنماوس پسپۆڕیی لە بواری **ئەنسرۆپۆلۆجیای دادیی** بە پلەی نایاب وەرگرت. (وەك خەڵاتێك لەسەر ئەرکی حکومەتی بەریتانیا بۆ ماوەی دوو مانگ بەشداری خولێکی مەشقی پزیشکی دادوەریی کرد لە پەیمانگای پزیشکی (جۆهانسبێرگ) لە وڵاتی ئەفریقای باشورو، پاشان گەڕایەوە بۆ سلێمانی، بەو هۆیەوە – بوونی پزیشکی پسپۆڕ- سەرجەم مەرجە زانستیو یاساییەکانی پێویست بە دامەزراندنی پەیمانگای پزیشکی دادیی تەواو بوو، پابەند بە ماددەی (٥)ی یاسای پزیشکی دادیی عێراقی ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٨٧ و، پشتگیری سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی سلێمانی بە فەرمانی وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستانی ژمارە (٢٥٦٨) لە ٢٠٠٦/٧/٩ پەیمانگای پزیشکی دادیی لە سلێمانی دامەزراو، د. **بەرزان دارتاش** بە فەرمانی کارگێڕی ژمارە (٥٨٦٢)ی فەرمانگەی تەندروستی سلێمانی لە ١٦/ ٨/ ٢٠٠٦ وەك یەکەم سەرۆکی پەیمانگاکە لە ١٧/ ٨/ ٢٠٠٦ دەست بەکار بوو، ئەمەش وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە بوارەکەدا، هەر لەو ساڵەدا توانرا خولی مەشقو فێربوونی بوارەکە بۆ (١٠) پزیشکی نەشتەرکارو (١٥) کارمەند بکرێتەوە، بەوەش توانرا بەشی پزیشکی دادیی لە قەزاکانی ( هەڵەبجە، قەڵادزێ، ڕانیە، کۆیە، چەمچەماڵ، کەلار، دربندیخان ) بکرێتەوە. لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٧دا هەریەك لەم پزیشکانە ( **د. هیوا محمود، د. بختیار رشید قادر ، د.کۆسرەت کمال نجم** [1] **، د. پاراو علی عبداللە، د. سەهەنگ**

---

[1] د. کۆسرەت کمال نجم، پزیشکی پەیمانگا ئێستا خاوەنی بڕوانامەی ماستەرە لە شیکاریی (D.N.A)، ( MSc DNA

**فاروق‌و، د. شێروان عبدالله عبدالکریم) وەك پزیشکی (مقیم اقدم)ی بوارە کە پەیوەندیان کرد بە پەیمانگاوەو، پاش ساڵێك لە خولی مەشق‌و فێربوون توانیان ببنە پزیشکی ڕاهێنراوی بوارەکە.**

**پاش ئەوە دوو پزیشکی پسپۆڕی نەشتەرگاری ڕاهێنراوی پزیشکی دادیی ( د. ئاسۆ حمە سعید و د. اکرم بورهان ) کە لە قەزاکان بوون گەڕانەوە بۆ پەیمانگاو، پزیشکی پسپۆڕی پزیشکی دادیی ددان ( د. هاژە عارف ) لە ئەوروپا بوو پەیوەندی کرد بە پەیمانگاوە، بەمەش پەیمانگای پزیشکی دادیی سلێمانی بوو بە ناوەندێکی زانستیی پزیشکی دادیی زۆر بەهێز. دەکرا هاوتای وڵاتە پێشکەوتووەکان بوارەکە پێش بخرێت، چونکە لەو ساڵانەدا بەغداش ئەوەندە پزیشکی پسپۆڕو شارەزای لە بوارەکەدا نەبوو. بەڵام مەخابن لەبەر بایەخ نەدانی پێویست‌و، نەبوونی هاندانی تەواو بۆ بژێوی‌و گوزەران‌و، پاراستنی ژیان‌و سەلامەتیان هەندێك لەو پزیشکانە بەشەکەیان گواستەوەو، پەیمانگەیان بەجێهێشت. لە ساڵی (٢٠٠٧) د. بەرزان بە مەبەستی بە دەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا ڕۆشتە دەرەوەی وڵات‌و، سەرپەرشتیکردنی پەیمانگا سپێردرا بە (د. محمد نوری). لە ساڵی (٢٠١٠) ( د. بەرزان دارتاش ) دکتۆرای لە بوارەکەدا بە دەست هێناو، گەڕایەوە پەیمانگا. ئەمەش بە یەکەم دکتۆرای پزیشکیی دادیی ئەژمار دەکرێت لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان .. پاش بە پەیمانگا بوون توانرا چەند بەشێك‌و تاقیگەیەکی پێشکەوتووی تێدا بکرێتەوە کە زۆربەی پشکنینە پێویستەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت.**

---

Profiling). لە زانکۆی (Uclan) لە وڵاتی بەریتانیا بە دەستی هێناوە.

**بەشەکانی پەیمانگا: پەیمانگا لەم بەشانە پێکهاتووە:**

١ – گروپی مردووەکان.

٢ – گروپی زیندووەکان.

٣ - بەشی کارگێڕیو خۆیەتی.

٤ – بەشی (D.N.A)

٥ – هۆبەی پاسایی.

٦ – بەشی تاقیگە.

٧ – خوێندنی خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکیو. کۆلیژی پۆلیس.

**بەشی تاقیگە ئەم کارانە ئەنجام دەدات:**

١ – پشکنینو شیکاری ڕێژەی کحول لە خوێنی هەر تۆمەتبارێکدا کەیسی پۆلیس بێت (مردوو بێت یان زیندو).

٢ – پشکنینو شیکاری بوونی ماددەی هۆشبەر لە خوێنی تۆمەتباردا.

٣ – پشکنینو شیکاری ماددەی ژەهرو دیاریکردنی زۆربەی جۆری ژەهرەکان.

٤ – پشکنینو شیکاری سپێرم لە تاوانە سێکسیەکاندا.

٥ – پشکنینو شیکاری پەڵەی خوێن بۆ زانینی سەرچاوەکەی .

٦ – پشکنینی پەڵەکان بۆ دیاریکردنی جۆرەکەی، ئایا خوێنە، یان سپێرم، یان شتی دیکەیە؟

٧ – پشکنین بۆ پاشماوەی باروت (G.S.R).

٨ – شیکاری ئەو سامپڵانەی‌س لە مردو وەردگیرێن، بۆ زانینی هۆی مردنەکەی.

**لە دواییدا دەڵێین:** ئەگەرچی شوێنی پەیمانگا شیاو نییە، بەڵام چالاکانە ئەرکەکانی تێدا ڕادەپەڕێنرێ، هەر لە توێکاری تەرمەوە، تا بینینی زیندوەکان بۆ کەیسە سێکسیەکانو، ئالودەبووانی مادده هۆشبەرەکانو، دیاریکردنی تەمەنو، هەڵدانەوەی گۆڕو، وتنەوەی وانەی پراکتیکیو تیۆری بۆ خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکیو پۆلیسو، ڕێکخستنی بڕوانامەی مردنو، پشکنینی تاقیگەیی بۆ ئەو کەیسانەی پەیمانگا مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، (زیندوو بێت، یاخود مردوو).

هەرێمی کوردستان

وەزارەتی تەندروستی
فەرمانگەی تەندروستی سلێمانی
کاروباری هونەری

ژمارە: ٧٦٩٠٦
رۆژ: ١٩/ ١٠/ ٢٠٠٦
٢٧٠٦/ / ١ =

فەرمانی کارگێری

دوا بە دوای فەرمانی کارگێریمان ژمارە (٥٨٦٢) لە ١٦/٨/٢٠٠٦ سەبارەت بە دانانی پزیشکی پسپۆری دادوەری (د.بەرزان محمد علی فرج) بە سەرۆکی پەیمانگای دادوەری سلێمانی ناوبراو دەست بەکاربوو رۆژی ١٧/٨/٢٠٠٦.

د. شێرکو عبدالله رشید
بەڕێوەبەری گشتی
٨/ ١٠/ ٢٠٠

وێنەیەک بۆ/-

- وەزارەتی تەندروستی /ب.گ. کاروباری تەندروستی / لەگەڵ ریزدا
- کاروباری هونەری / کامل.
- پەیمانگای دادوەری سلێمانی.
- ژمێریاری دیوان.
- نەخشەکێشان.
- سەندیکای پزیشکان.
- دۆسیەی کەسیتی/لەگەڵ بەراییەکاندا.

کاروباری هونەری.

## لقی سێیەم: پزیشکی دادیی له هەولێر:

بە پێی ئەو زانیاریانەی لە پەیمانگەی پزیشکی دادیی هەولێرەوە دەستگیر بوو، له سالّی (١٩٥٨) پزیشکی دادیی له هەولێر کراوەتەوە، بەلاّم بەشێك بووە له نەخۆشخانەی کۆماریی هەولێر، شێوەی کارکردن تیایدا بە شێوەی ئێشکگریی بووە، واتە: ئەو کەیسانەی له لایەنی پۆلیس‌و دادگاو لێکۆڵینەوەوە ڕەوانە دەکران بۆ پزیشکی دادیی، پزیشکی نەشتەرگەری ئێشکگر توێکاریی بۆ کردووە.

**یەکەم:** ئەم بەرێزانە بەڕێوەبەری پزیشکی دادیی بوون له هەولێر:

أ - د. صبیح لطف إسماعیل ، ب – د. دخیل سعید خضر.

**دووەم:** له سالّی (٢٠٠٢) بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران پزیشکی دادیی هەولێر کراوە بە پەیمانگەی پزشکی دادیی هەولێر.

**سێیەم:** له سالّی ٢٠٠٦وە (د. یاسین کریم أمین) پزیشکی دادیی پسپۆڕ وەك بەڕێوەبەری گشتی پەیمانگەکە دەست بەکار بووە.

**چوارەم:** ئێستا ئەم پزیشکانە له پەیمانگەی پزیشکی دادیی هەولێر کار دەکەن:

١ – د.فیصل عارب حمد.
٢ – د.هۆشیار محمد عارف
٣ – د.ئازاد عبدالله حسن.
٤ – د.هاوڕێ دڵزار عبدالرحمن.
٥ د.فەزیلە کمرخان إسماعیل.
٦ – د.جمیلە صالح حمد أمین.
٧ – د.دیلمان ئازاد حسن.
٨ – د. بەناز نوری صالح.

**پێنجەم: بەشەکانی پزیشکی دادیی:**

**پەیمانگەی پزیشکی دادیی هەولێر ئەم بەشانەی تێدایە:**

**١ – بەشی مردووان: ئەرکی ئەم بەشە توێکاریکردنی ستەرمی ئەو مردووانەیە کە لە پۆلیسەوە یاخود لە دادوەری لێکۆڵینەوە بۆی ڕەوەانە دەکرێت، ئەم پزیشکانەش کاری تێدا دەکەن: أ – د. فیصل عارب حمد، ب – د.ئازاد عبدالله حسن، د.جمیلە صالح حمد أمین.**

**٢ – بەشی زیندووان: ئەرکی ئەم بەشە مامەڵەکردنە لەگەڵ کەیسەکانی وەك: دیاریکردنی تەمەنو، تاوانە سێکسیەکانو...هتد. ئەم پزیشکانە کاری تێدا دەکەن:**

**أ – د.هۆشیار محمد عارف، ب – د.فەزیلە کمرخان إسماعیل.**

**٣ – بەشی تاقیگە:**

**بەشی تاقیگە ئەم پشکنینانەی خوارەوە دەکات:**

**( هیستۆپاسۆلۆجی، بایۆکیمستری، سیرۆلۆجی، (D.N.A)، کحول، ژەهرەکان، ماددە هۆشبەرەکان، گروپی خوێن، سپێرم، سکپڕی).**

**٤ – بەشی گۆڕی بە کۆمەڵ: د.ئازا خضر بهرام بەڕێوەی دەبات، ئیشی ئەم بەشە گەڕانە بە شوێن ئەو کەسانەی لە تاوانەکانی جینۆسایدا کوژراون، یان لە هەر ڕوداوێکدا مردوونو، بە کۆمەڵ نێژراونو، دەبێت ئێسكو پروسکەکانیان جیابکرێنەوەو، بناسرێنەوە.**

**٥ – بەشی تیشك: د. إبراهیم عبدالنافع بەڕێوەی دەبات.**

**٦ - بەشی توێژینەوەی زانستی: ئەم پزیشکانە کاری تێدا دەکەن: ( د.هاوڕێ دڵزار عبدالرحمن، د.دیلمان ئازاد حسن، بەناز نوری صالح).**

**٧ - بەشەکانی یاسا، کارگێڕیی، ئەندازە، ڕاگەیاندن....) ئەم بەشانە کاری ڕۆژانەی خۆیان ڕادەپەڕێنن.**

### لقی چوارەم: پزیشکیی دادیی له دهۆك:

ویستمان لقی چوارەم تەرخان بکەین بۆ پزیشکی دادیی له دهۆك، بەڵام به داخەوە هەرچەند له ڕێی ئیمەیڵو تەلەفۆنو نامەوە پەیوەندیمان پێیانەوە کردو بۆ ماوەی زیاتر له مانگێك چاوەنوارپیمان کرد، سەرئەنجام له بەرواری ٢٠١٦/١/١٤ له ڕێی مۆبایلەوە به نامەیەك ئاگاداریان کردینەوە که هیچ زانیاریەکمان لانییە، بۆیە نەمانتوانی هیچ شتێك لەسەر پزیشکی دادیی دهۆك بنوسین بۆیە داوای لێبوردن لەو پزیشكو کارمەندانە دەکەین که لەوێ کاریان کردوەو کار دەکەن، لەبەر پێنەدانی زانیاری نەمانتوانی ناویان دیکۆمێنت بکەینو، ماندوبوونیان بنرخێنین.

### لقی پێنجەم: پەیوەندی پزیشکی دادییو دەزگای دادوەریی:

شارەزا بەو کەسانە دەوترێ بۆ دەربڕینی ڕاو بۆچونیان له یەکلا کردنەوەی کێشەو دوژمنایەتیەکاندا له زانستە جۆربەجۆرەکاندا پشتیان پێ دەبەسترێ، به گوێرەی یاسای شارەزایانی ژمارە (٦٣)ی ساڵی ١٩٧٤ز، پاش ئەوەی شارەزا له بەردەم سەرۆکی دادگای تێهەڵچونەوەدا سوێند دەخوات به پاکیو بێلایەنی کارەکەی ئەنجام بدات. له تۆمارێکی تایبەتدا ناوی تۆمار دەکرێت. پاشان پێناسی شارەزای (دادوەریی) پێ دەدرێت... بێجگە لەوانەش هەندێك جاریش دادوەر پەنا بۆ فەرمانگەیەکی تایبەت دەبات فەرمانبەرێکیان هەڵبژێرن وەك شارەزا له پسپۆڕیەکەی خۆیدا، یان داوا دەکات ئەو فەرمانگەی له بنەڕەتدا پسپۆڕە به پێشکەش کردنی شارەزایی بۆ لایەنی پەیوەندیدار بەو کارە هەڵبسێ، وەك پزیشکیی دادییو، بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی بەڵگەکانی تاوان. (٢٣).

بەڵام بۆ شێوازی دانانی شارەزا به پێی بڕگەی (أ)ی ماددەی (٦٩)ی **قانون اصول المحاكمات الجزائيه** ئامڕازی یاسایی پەیوەندیکردنی پزیشکی دادیی به دەزگای دادوەرییەوە ئەوەیە: دادوەر، یان لێکۆڵەر داوا له پزیشکی دادیی دەکەن وەك "شارەزا" ڕاو بۆچونی خۆی لەبارەی ئەو تاوانەوە دەربڕێ که لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێت، یان لایەنێکی کێشەکە داوا دەکات بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکە شارەزایەك دابنرێت.(٢٤).

هەرکاتێکیش دەزگای دادوەریی داوای لە پزیشکی دادیی کرد کارێکی پزیشکیی دادیی ئەنجام بدات، پزیشکیی دادیی لەسەریەتی بڕوات بەدەم داواکەی دەزگای دادوەرییەوەو، بە ئەرکی خۆی هەڵبستێ. بڕگەی یەکەمی ماددەی (١٠١)ی یاسای تەندروستی گشتیی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ز. دەڵێ: ﴿پزیشکی دادیی لەسەریەتی توێکاریی ئەو تەرمانە بکات کە لە بنکەی پۆلیسەوە، یان لە دەسەڵاتی لێکۆڵینەوەوە بۆ دۆزینەوەی هۆی مردنەکەی ڕەوانە دەکرێت، ڕاپۆرتی پێویست بدات بە لایەنی فەرمیی تایبەتمەند﴾. (٢٥). بە پێی یاسای سەرەوە هەرکات دەزگای دادوەریی لەکەیسێکدا پێویستی بە ڕای پزیشکی دادیی هەبوو دەبێت وەڵام بدرێتەوە، چونکە ڕاپۆرتی پزیشك یارمەتیدەرە بۆ بەرچاو ڕوونی یاسا تا لەو بارەیەوە بڕیاری دروست بدات. خۆ ئەگەر پزیشکیی دادیی وەڵامی نەدایەوەو، ئەرکەکەی ئەنجام نەدا ئەوە ئەرکی پیشەیی خۆی ڕانەپەڕاندوەو، لەوانەیە ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی بەرزەفتکردن ببێتەوە، چونکە لەوانەیە بە وەڵام نەدانەوەی ئەو مافی کەسێك بفەوتێ. لە ماددەی (٢٧)ی یاسای سەندیکای پزشکانی هەرێمی کوردستانی عێراقی ژمارە (٦)ی ساڵی (٢٠٠٠) دا هاتووە دەڵێ: ﴿هەر پزیشکێك زیان بە ئەرکی پیشەیی بگەیەنێ، یان کارێکی قەدەغەکراو بکات یاخود کارێکی وا بکات پایەی پیشەکەی کەم بکاتەوە، یان بڕیارەکانی سەندیکا بە پێی حوکمەکانی ئەم یاسایە جێبەجێ نەکات خۆی توشی ئەو سزایە دەکات کە لە یاساکەدا هاتووە، بەبێ ئەوەی ئەم کارە پەیوەندی هەبێ بەو کارانەی بە پێی یاسای دیکە لە دژی دەکرێ﴾. (٢٦).

ئەگەر نەخۆشێکی پێکراو ڕۆشتە لای پزیشکێك‌و، ئەویش بۆی دەرکەوت هۆی پێکرانەکە تاوانکارییە، ئەو پێکرانە ببێتە هۆی مردنی یان نەبێت، دەبێت پاش چارەسەرکردنی، ئاگاداری نزیکترین بنکەی پۆلیس بکاتەوە. خۆ ئەگەر پێکراوەکە مرد ئەوکات ڕەوانەی پزیشکیی دادیی بکرێت بۆ توێکاری‌و، زانینی هۆی مردنەکەی. (تێبینی: لەو نەخۆشخانانەی بنکەی پۆلیسی تێدایە پۆلیس لە ڕێی "فۆرمی داواکردنی توێکاری" تەرمەکە ڕەوانەی پزیشکی دادیی دەکات).

ئەگەر پۆلیس کەسێکی نەخۆشی نارد بۆ دەزگایەکی تەندروستی‌و، نەخۆشەکە لەوێ مرد، لەسەر دەزگاکەیە تەرمەکە بنێرێ بۆ پزیشکیی دادیی‌و، هەواڵی مردنەکەش بدات بەو

بنکەیە نەخۆشەکەی بۆ ڕەوانەکردوە. برگەی یەکەمودووەمی ماددەی (١٠١)ی یاسای تەندروستی گشتی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ . (٢٧).

بە سەرنجدان لە گرنگیو ترسناکی ئەو زانیاریانەی لە بڕوانامە پزیشکیەکاندا هەیە کە پزیشکی دادیی دەینوسێت، چارەنوسی چەندین کەسی پێوە بەستراوەتەوە، لە پێشێلکردنی مافیان، یان لە پاراستنی مافیان، یان لە پاراستنی دادپەروەری بە گەڕاندنەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی، بۆیە دەبێت لە توێکاریو ڕاپۆرت نوسیندا پزیشك ڕەچاوی پرەنسیپە پزیشکیو مرۆڤایەتیەکان بکات.

## سەرچاوەکان:


١ – محمد بن يعقوب الفيروزئابادى، القاموس المحيط، نشر دار نوبليس، لبنان طبعة الأ لى، ٢٠٠٦م، ج١، ص١٦٣.

٢ – د. منصور عمر المعايطة، الطب الشرعي في خدمة الأمن والقضاء. الرياض، ٢٠٠٧م ،ص١٦. www. Lejuriiste. Montadalhilal. com

٣ – الراغب الاصفهانى، مفردات الفاظ القرآن الكريم، ناشر مكتبة المرتضوية، مطبعة خورشيد، طبعة ثانية، ١٣٦٢هـ.ش، ص٤١٨. الفيروزنابادى، القاموس المحيط، ج١٠، ص١٨١٥.

٤ - د. كاظم المقدادي ، الطب العدلي والتحري الجنائي، ٢٠٠٨م، ص٢٨. https;// drive. Google. com

٥ – د. وصفي محمد علي، الوجيز في الطب العدلي، نشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة،١٩٧٦م.، ص٧.

٦ – د. منصور عمر المعايطة، الطب الشرعى في خدمة الأمن والقضاء، الرياض، ص١٧.

٧ – د. كاظم المقدادي، الطب العدلي والتحري الجنائي، ص٢٨.

8 – https.//www.Facebook.com/Drasatw.wbh

٩- د. نبيل الخطيب، الطب العدلي، محاضرات جامعة بغداد كلية الطب. www.comed.uobaghdad ldu.iq

١٠ - لقمان فاروق حسن نانةكةلي، المسؤولية القانونية في العمل الطبي، الناشر مكتبة زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٣، ص٥٩. و (hmethics. blogspot. com) .

١١- droit7.blogspot.com.google.13october ٢٠١٣

١٢ - د. محمد علي الصلابي، تأريخ الخلفاء الراشدين، دار الكتاب العربي، بيروت، الطبعة الثانية، ٢٠٠٥م، ج٤، ص١٧٦.١٧٨.

١٣– د. حافظ علوان حمادي الدليمى، حقوق الإنسان، مطبعة رهند، السليمانية، سنة٢٠٠٨، ص٣.

**١٤ – د.حسين عبدالصاحب الربيعي، جرائم الإعتداء، على حق الإنسان في التكامل الجسدي، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، طبعة اولى، سنة ٢٠١١م، ص١٧.**

**١٥ – د. نبيل الخطيب؛ نظام الطب العدلي، محاضرات في كلية طب بغداد.** https.www.google.iq/gfe-rd

**١٦ - د. نبيل الخطيب؛ نظام الطب العدلي، محاضرات في كلية طب بغداد.** https.www.google.iq/gfe-rd

**١٧ – بروانة: د. نبيل الخطيب، الطب العدلي، محاضرات جامعة بغداد كلية الطب ، سابق الاشارة اليه.**

**١٨ – قانون الطب العدلي؛ رقم (٣٧) لسنة ٢٠١٣، الوقائع العراقية في ٢٨/١٠/٢٠١٣.**

**١٩ – اعداد د.جابر مهنا الحسيناوي، المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية القوانين والانظمة والتعليمات، الناشر مركز الطباعةوالنشر العلمي، بغداد، العراق، الطبعة الأولى، ٢٠٠٩م، ص٤٥٤.**

**٢٠ – د. جابر مهنا الحسيناوي؛ ل٥٨١_٥٩٠.**

**٢١ – د. جابر مهنا الحسيناوى، ل٤٥٤.**

**٢٢ – د. جابر مهنا الحسيناوى، ل١٧٧.**

**٢٣– د.براء منذر كمال عبداللطيف، شرح قانون أصول المحاكمات الجزائية، دار ابن الأثير للطباعة والنشر، جامعة موصل، الطبعة الثانية، ٢٠١٠م، ص١٣٧_١٣٩.**

**٢٤ – اعداد القاضي نبيل عبدالرحمن، قانون أصول المحاكمات الجزائية، نشر المكتبة القانونية، بغداد،**

**طبعة اولى، سنة ٢٠١٢، ص٢٧.**

**٢٥– اعداد د.جابر مهنا الحسيناوي، المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية، ص١٨١.**

**٢٦ – ياساى ژمارە (٦)ى سالى (٢٠٠٠)ى سەنديكاى پزيشكانى هەريمى كوردستانى عيراق، لە ژمارە (٥)ى وقائعى كوردستان لە ٢٥/١١/٢٠٠٠دا بلاو كراوەتەوە.**

**٢٧ – قانون الصحة العامةرقم ٨٩ لسنة ١٩٨١ وتعديلاته، اعداد المحامى ذاكر خليل العلى، منشورات مكتبة الجيل العربى، موصل، طبعة ثانية، ص٦٠.**

# بەشی دووەم: کەیسەکانی پزیشکیی دادیی:

ئەم بەشە پەیوەندی بەو کەیسانەوە هەیە کە بە دەستدرێژیکردنە سەر جەستەی مرۆڤ دادەنرێن و، پزیشکی دادیی لە ڕێی شارەزاییی‌و تاقیگەوە تاوانکاریەکان بۆ دادوەریی ئاشکرا دەکات، لەم بەشەدا حوکمی توێکاری تەرمی مردوو لە شەریعەتی ئیسلام و، یاسادا ڕونکردوەتەوە، بەشەکەش لەم سێ تەوەرە پێکهاتووە:

**تەوەری یەکەم: کەیسەکانی دەستدرێژیکردنە سەر جەستەی مرۆڤ:**

**تەوەری دووەم: پشکنینی تاقیگەیی:**

**تەوەری سێیەم: مردن‌و حوکمی توێکاریی تەرمی مردوو لە شەریعەتی ئیسلام‌و یاسادا:**

# تەوەری یەکەم: کەیسەکانی دەستدرێژیی کردنە سەر جەستەی مرۆڤ:

## لقی یەکەم: برینەکان (الجروح):

### یەکەم: برین چی یە ؟

برین بریتییە لە جیابوونەوەو لێکترازانی هەر شانەیەك لە شانەکانی لەش لە یەکتر، لە ئەنجامی توندوتیژیەك بەر شانەکانی لاشە بکەوێت، ئەگەرچی ئەو جیابوونەوە لە دەرەوە بێت وەك پێست، یان لە ناوەوە بێت وەك ئێسكو ماسولکەکان. (١).

### دووەم: دابەشکردنی برینەکان:. (٢)

#### ١ – برینەکان و یاسا:

برینەکان لە ڕوی یاساوە دەکرێن بەم بەشانەی خوارەوە:

أ – برینی سادە: ئەو برینەیە ترسناکیی لەسەر ژیانی پێکراوەکە نییەو، برینەکە لە (٢٠) ڕۆژ کەمتر ساڕێژ دەبێتو، هیچ پەککەوتنو تێکچونێکی لێ ناکەوێتەوە.

ب – برینی ترسناك: ئەو برینەیە کە دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر ژیانی مرۆڤو، ساڕێژبوونی لە (٢٠) ڕۆژ زیاتر دەخایەنێتو، پەککەوتنو تێکچونیشی لێ دەکەوێتەوە.

ج – برینی کوشندە: ئەو برینەیە هەمیشە چاوەنواڕی مردنی بریندارەکەی لێ دەکرێت و، ڕزگاربوون لێی جێی سەرسوڕمانە. واتە: ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی مردن.

لەمانەی سەرەوە دەردەکەوێت برینەکان بە پێی سروشتیانو، ئەو ئامێرەی بەکار دێت جیاوازن، بۆیە ئەنجامەکانیشیان جیاوازن، لەسەر ئەوە سزاکانیش کە یاسا دەیسەپێنێ جیاوازن. دیاریکردنی جۆری برینەکەو، ڕادەی پەککەوتن لە لایەن پزیشکی دادییەوە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر دیاریکردنی جۆری تاوانەکەو، گونجاندنی یاسایی لەلایەن دادوەرەوە دەبێت. ئەمەش پایەیەکی پاراستنی دادپەروەرییە.

**٢ – برینەکان و پزیشکی دادیی: (٣).**

**برینەکان له لایەن پزیشکی دادییەوە دەکرێن بەم بەشانەی خوارەوە:**

**أ – برینە روشان (سحجة): بریتییە لە ڕوشان‌و داماڵینی پێست بە هۆی بەرکەوتنێکی توندەوە، ڕوشان سادەترین جۆری برینەو، لە دیدی چارەسەری پزیشکییەوە هیچ گرنگییەکی نییە، بەڵام لە دیدی پزیشکی دادییەوە گرنگییەکی گەورەی هەیە.**

**ب – برینە کوتران (الرضوض): بریتی یە لە ڕژانی خوێن لە ناو شانەکانی جەستەدا، لە ئەنجامی بەرکەوتنی هێزێك وەك بەرد، دار دەبێتە هۆی پچڕانی شانەکان و تەقینی مولولەکانی خوێن لە ناوەوە.**

**ج – برینی بڕاو (جروح قاطعة): ئەو برینەیە لە ئەنجامی ڕاکێشان یان پیاهێنانی ئامێرێکی تیژ بە سەر پێستدا دروست دەبێت، وەك چەقۆ. جۆرەکانیشی ئەمانەن: تاوانکاریی، خۆکوژی، لەناکاو (بەڕێکەوت)، دروستکراو.**

**د – برینی پیاچەقاندن (جروح طعنية): لە ئەنجامی لێدان بە پیاچەقاندنی ئامێرێك دروست دەبێت نوك‌و دەمی تیژی هەبێت، وەك چەقۆو خەنجەر. یان تەنیا نوکەکەی تیژ بێت وەك بزمار.**

**سێیەم: برینی دروستکراو** (جروح مفتعلة): (٤).

**پێناسە:** ئەو برینەیە کەسێك خۆی، یان بە ڕێکەوتن لەگەڵ کەسێکی تردا دروستی دەکات.

**هۆی خۆ بریندارکردن چی یە ؟ بۆ دەستخستنی ئامانجێك لەم ئامانجانەی خوارەوەیە.**

أ – له تاوانی كوشتندا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ بەرگری له خۆی كردوەو، بەرامبەر هەوڵی كوشتنی ئەمی داوە، بۆیە له ناچاریدا ئەوی كوشتووە، وەك هەوڵێك بۆ بیانوی تاوانەكەی.

ب – له بەشی پۆلیسدا: (ئیدعاكردن) بانگەشەی ئەوەی، گوایە پۆلیس له كاتی گرتنو، لێكۆڵینەوەدا دەستدرێژییان كردوەتە سەریو، ئەشكەنجەیان داوەو، بریندارییان كردووە.

ج – له بەردەم دادوەردا: بە مەبەستی دان پیانەنان، یان وا دەربخات دان پیانانەكەی بە زۆرلێكردن بووە.

د – له گرتووخانەدا: بۆ ئەوەی بەندكراوەكە بگوازرێتەوە بۆ نەخۆشخانەو، لەوێ ئاسانكاریی بكرێت بۆ هەڵهاتنو دەربازبوونی، یان له نەخۆشخانە بحەوێتەوە.

هـ – له تاوانی دزیكردندا: پاسەوانەكە لەتەك دزەكاندا رێكدەكەوێت بریندار بكرێ، گوایە ئەو بەرگریی له خۆی كردوەو، دزەكان بەسەریدا زاڵ بوونو، دزێكە كراوە.

و – بۆ تۆمەتباركردنی كەسێك، بە مەبەستی تۆڵە لێكردنەوە.گوایە ئەو كەسە بریندای كردوە.

ز – له كارگەكاندا بۆ وەرگرتنی قەرەبوو، یان وەرگرتنی مۆڵەتی نەخۆشیی. كرێكار ئەوە دەكات.

ح – له كاتی ئەركو فەرماندا، بۆ خۆدزینەوە له كاركردن.

**چوارەم: بریندارپوون بە چەكی ئاگرین (الجروح النارية):**

چەكی ئاگرین: ئامێرێكی ئامادەكراوە بۆ تەقاندنی فیشەكو تەقەمەنی، بە هۆی هێزی ئەو گازەی كە له سوتانی باروتەوە دروست دەبێت. (٥).

ئەوەی لای لێکۆڵەر گرنگە لە بریندار بوون بە چەك، پزیشکی دادیی دەتوانێت وەڵامی بداتەوەو، بەرچاو ڕوونی بدات بە دادوەرو دادگا لە زانستێکدا لای دادوەر نییەو، بۆ دەستخستنی پەنا بۆ پزیشکی دادیی دەبات. مەبەستەکەش بڕیاردانی دروستە لە کەیسەکەداو، چەسپاندنی دادپەروەریو، پاراستنی مافەکانە، لێرەدا پێگەی پزیشکی دادیی لە جێبەجێکردنی یاسا بە دروستی دەردەکەوێت، لەو خاڵانەش پزیشکی دادیی دەستنیشانی دەکات ئەمانەن: (٦).

١ – دەتوانێت ئەوە دیاری بکات، ئایا ئەو برینە لە ئەنجامی پێکان بە چەك ڕویداوە، یان بەهۆی شتێکی ترەوە بووە.

٢ - دەتوانێت ئاراستەی پێکانەکە دیاری بکات، کە زۆر جار سەرە داوێکی گرنگە لە لێکۆڵینەوەدا.

٣ - دەتوانێت دوریو نزیکی تەقەلێکردنەکە دیاری بکات.

٤ – دەتوانێت بە نزیککراوەیی پێکرانەکە دیاری بکات، ئایا تاوانکارییە، یان خۆ کوژییە، یان بە ڕێکەوتە، یان دروستکراوە.

٥ – باری تەندروستی پێکراوەکە دەستنیشان دەکاتو، ماوەی پێویستیش بۆ چارەسەرکردنی دەخەملێنێ.

٦ – دیاری دەکات ئایا برینەکە بە زیندویی ڕویداوە، یان پاش مردن تەقەی لێکراوەو، برینەکە بە مردوویی دروستبووە.

٧ – دیاریکردنی کاتی پێکرانەکەو، کاتی مردنەکە، ئەگەر مردبوو.

**پێنجەم: پزیشکیی دادییو برینەکان : (٧).**

لە خوارەوە ڕونکردنەوە لەسەر ئەو خاڵانە دەدەین کە پەیوەندی بە لێکۆڵەرەوە هەیە، وەك ئەو گرفتانەی ڕوو بەڕووی لێکۆڵەر دەبنەوەو، ڕێگرن لە بەردەم لێکۆڵینەوەداو، پزیشکی دادیی ئاسانکاری دەکات بۆ جێگیربوونی دادپەروەریو، پاراستنی مافەکان. پزیشکی دادیی لە

میانەی ئەو زانستەی كە هەیەتی‌و، بە پێی ئەو گۆڕانكاریەی لە جەستەی پێكراوەكەدا ڕودەدات، وەڵامی پرسیارەكانی دادوەر دەداتەوەو، لایەنە تاریكەكان ڕۆشن دەكاتەوەو، نزیكمان دەكاتەوە لەو سەرە داوانەی بەهۆیانەوە تاوانكارو، جۆری تاوانەكە بدۆزینەوە.

أ – جۆری پێكرانەكە: لە دیدی پزیشكی یەوە دەتوانین بڵێین پێكرانەكە بە ئامێرێكی تیژ، یان بڕندە، یان كوتێنەر ڕویداوە.

ب – جۆری ئامێری بەكارهاتوو: هەندێك جار دەتوانرێ ئامێری بەكارهاتوو لە تاوانەكەدا دیاری بكرێت، ئایا دوولا تیژە، یان یەك لا تیژە، یان خڕە... هتد.

ج – دەستنیشان كردنی چەكێكی دیاریكراو: هەندێك جار پزیشكی دادیی دەتوانێت بە دڵنیاییەوە بڵێت: ئەم برینە بەم ئامێرە ئەنجام دراوە، یان بەم ئامێرە ئەنجام نەدراوە.

د – چۆنیەتی پێكرانەكە: پزیشكی دادیی ئەوە دیاری دەكات، ئایا ئۆتۆمبێل بەسەریدا هاتووە، یان لە ڕۆشتنی ئۆتۆمبیلەكەدا كەوتووەتە خوارەوە، پێكرانەكە ڕاستەوخۆ بووە، یان ناڕاستەوخۆ بووە، وەك شكانی بنكەی كەلەسەری كەسێك لە كاتێكدا لە بەرزییەك كەوتووەتە خوارەوەو، تەنیا قاچی بەر زەوی كەوتووە، یان ئێسكی چەڵەمەی شكاوە لە كاتێكدا لە كەوتنە خوارەوەدا دەستی بەر زەوی كەوتووە.

ھ – كاتی پێكرانەكە: پزیشكی دادیی دوای لە بەرچاو گرتنی فاكتەرەكان دەتوانێت بە نزیككراوەیی كاتی برینداربوونەكە دیاری بكات.

و – دەستنیشان كردنی باری پێكراوەكە: گرنگترین شت كە پەیوەندی بە لێكۆڵەرەوە هەیە باری پێكراوەكەیە، ئایا باشە، یان ترسی مردنی لێ دەكرێت؟ چونكە ئەوە پەیوەندی بە تۆمەتبارەوە هەیە، ڕابگیرێت، یان بە دەستەبەر ئازاد بكرێ، ئایا باری

تەندروستی پێکراوەکە ڕێگا دەدات وتەکانی وەربگیرێت، پزیشکی دادیی دەتوانێت بە ڕاپۆرتێك وەڵامی لێکۆڵەر بداتەوەو، بەرچاو ڕوونیی پێ بدات[٢].

ز – کاتی پێویست بۆ چارەسەر: پزیشکی دادیی بە نزیکەیی دیاری دەکات ماوەی چاکبوونەوەی برینەکە چەندە دەخایەنێت، ئەمەش گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ دادوەر، تا جۆری تاوانەکە دیاری بکات.

ح – ڕودانی پەککەوتنو لە کارکەوتن: پەککەوتن ئەوەیە ئەندامی پێکراو بە تەواوی لە کار بکەوێت وەك برینەوەی دەست، یان پەککەوتنی لاوەکی وەك شەل بوون. بۆ ئاسانکاری دەستەڵاتی لێکۆڵینەوەو دادوەریی، پزیشك باری پەککەوتنو، ڕێژەی سەدی لە کارکەوتن دیاری دەکات.

---

[٢] تێبینی: [١]-ئێمە ناڵێین دادوەر ڕاستەو ڕاست بە پێی ڕاپۆرتی پزیشکی دادیی بڕیاری ڕاگرتنی تۆمەتبار، یاخود بەردانی بە دەستەبەر دەردەکات، چونکە ئەوە لە دەستەڵاتی خودی دادوەردایەو، ئەویش بە پێی یاسای **(اصول المحاکمات الجزائیه)** بڕیار دەدات وەك لەخوارەوە بە کورتی لەسەری دەدوێین، بەڵام ڕاپۆرتی پزیشکی دادیی یەکێك لەو بەڵگانەیە دادوەر دەیکاتە پاڵپشتی بڕیارەکەی. بە پێی ماددەی (١٥٧)ی **یاسای اصول المحاکمات الجزائیه ژمارە ٢٣ ی ساڵی ١٩٧١ی هەموار کراو** لەسەر بڕیاری مانەوە یان بەردانی تۆمەتبارەکە دەڵێ: ﴿ دادگا بۆی هەیە لەهەر کاتێکی سەیرکردنی داوای تۆمەتباری ڕاگیراو بڕیاری بەرەڵاکردنی بە دەستەبەر یاخود بەبێ دەستەبەر بدات ئەگەر ڕاگیراوەکە تۆمەتبار نەبێ بە تاوانێك سزاکەی ئیعدام بێت، بۆیشی هەیە بڕیاری گرتنو ڕاگرتنی تۆمەتبارێك بدات ئەگەرچی پێشتریش بڕیاری بەردانی درابێت، بە مەرجێك لە بڕیارەکەیدا ئەو هۆکارانە ڕوون بکاتەوە کە پشتی پێبەستوون﴾. دیارە دەبێت داوەر ڕەچاوی بڕگەی (أوب)ی ماددەی (١٠٩)ی هەمان یاسای سەرەوە بکات کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿ أ ئەگەر کەسی گیراو بە سزایەك تۆمەتبار بێت سزا بدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك زیاتر بێت لە سێ ساڵ، یاخود بە زیندانیکردنی کاتیی یان هەمیشەیی، دادوەر بۆی هەیە فەرمان بدات بە ڕاگرتنی بۆ ماوەیەك لە ١٥ ڕۆژ زیاتر نەبێتو، بە پێی پێویستیش تازەی بکاتەوە، یاخود بڕیاری بەردانی بدات بە وەرگرتنی بەڵێننامەو دەستەبەری کەسێکی زامن، یان بە بێ دەستەبەر، بە مەرجێك هەرکاتێك داوای لێکرا ئامادە ببێتو، دادوەر بزانێت بەردانەکەی نابێتە هۆی هەڵهاتنیو، زیانیش ناگەیەنێت بە ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکە.

[٢] - ئەگەر دەستگیرکراوەکە تۆمەتبار بێت بە تاوانێك سزاکەی ئیعدام بێت دەبێت ڕابگیرێتو، هەرکات پێویستیی لێکۆڵینەوە خواستی ڕاگرتنەکەی بۆ درێژ بکرێتەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو ماوەیەی لە بڕگەی (أ)دا هاتووە، پاش کۆتایی هاتنی لێکۆڵینەوەی سەرەتاییو دادوەرییو دادگاییکردن، لە لایەن دادوەری لێکۆڵینەوە یاخود دادگای تاوانەکانەوە بڕیاری یەکلاکەرەوەی لەسەر دەدرێت﴾.

گ – زیندە پێکران: زیندە برین واتە ئەو برینەی لە ژیاندا ڕویداوە، پزیشکی دادیی دەتوانێت ئەوە دیاری بکات ئایا برینەکە لە ژیاندا ڕویداوە، یان پاش مردن برینەکە ڕویداوە، ئەم بابەتە لە دیدی لێکۆڵینەوەوە گرنگیی خۆی هەیە، چونکە ئەگەر برینەکە لە ژیاندا ڕویدابێت، یان لە دوای مردن ڕویدابێت، حوکمو بڕیاری دادگا جیاواز دەبێت.

ی – هۆکاری مردنەکە: کاتێك لێکۆڵەر گومانی لە هۆی ڕاستەقینەی مردنەکە هەیە، پەنا دەباتە بەر پزیشکی دادیی، ئەویش ئەوە دیاری دەکات ئایا برینەکە هۆی ڕاستەوخۆی مردنەکەیە، یان هۆکاری تر بەشدارە تیایدا.

**لقی دووەم: سوتان:**

سوتان لەناوچونی شانەکانی لەشە لە ئەنجامی بەرکەوتنی سەرەوەی لەش لە سەرچاوە جیاوازەکانی گەرمیی، یان بەرکەوتنی ماددەیەکی کیمیاوی، یان فیزیاوی وەك بەرکەوتنی تەزوی کارەبا، یان هەورە بروسکە. (٨).

**پزیشکی دادییو سوتان، (٩).**

لە ڕوداوی سوتاندا پزیشکی دادیی دەتوانێت وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری لێکۆڵەر بداتەوە، کە لەڕێگەیانەوە ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکە بەرەو ئاقارێکی دروست ببات:

١ – دیاریکردنی پێکرانەکە ئایا بە هۆی سوتانەوە ڕویداوە، یان لە شتی ترەوە بووە.

٢ – کاتی ڕودانی سوتانەکە، پزیشکی دادیی بە نزیکەیی دیاری دەکات سوتانەکە کەی ڕویداوە.

٣ – جۆری سوتانەکە، پزیشکی دادیی دیاری دەکات ماددە سوتێنەرەکە چی بووە، ئاگر بووە، شلەی گەرم بووە، یان ماددەی کیمیایی سوتێنەر بووە.

٤ – زیندویی سوتانەکە، ئەوە دیاری دەکات ئایا سوتانەکە لە کاتی ژیاندا ڕویداوە، یان پاش مردن سوتێنراوە.

٥ – باری تەندروستی پێکراو، پزیشکی دادیی باری تەندروستی پێکراوو، ڕێژەی پەککەوتنی چەندەو، ماوەی چاکبوونەوەی چەندە دەخایەنێت دیاری دەکات.

٦ – دیاری دەکات ئایا پێکرانەکە تاوانکارییە، یان خۆ کوژیە، یان ڕوداوی بە ڕێکەوتە.

**لقی سێیەم: خنکان (الاسفکسیا):**

پێناسەی خنکان: خنکان بێبەشکردنی شانەکانی لەشە لە بڕی تەواوی ئۆکسجینی پێویست بۆ بەردەوامبونی ژیان. (١٠).

ئەوانەی بە خنکان دەمرن هەمیشە دەستەواژەی ئەسفێکسیایان بۆ بەکار دەهێنرێ، بەڵام لە بنەڕەتدا وشەی ئەسفێکسیا لە زاراوەدا واتە: نەمانی لێدانی دڵ، ئەمەش مانای ئەوەیە ناولێنانی مردن بە خنکان بە ئەسفێکسیا ورد نییە، چونکە هەموو مردنێك نەمانی لێدانی دڵ لەگەڵ خۆیدا دێنێت. هەرچەند بەکارهێنانی وشەکە لە هەڵە باوەکانە، بەڵام لە ئاستی جیهاندا وشەکە بەکاردێت. واتە زاراوەی ئەسفێکسیا بۆ ئەو مردنانە بەکاردێت کە لە ئەنجامی کەمی ئۆکسجین لە خانەکانی لەشدا ڕودەدات، ئیتر نەمانی ئۆکسجین بە هەر هۆیەکەوە بێت. (١١).

**جۆرەکانی خنکان: (١٢).**

١ – هەناسەبڕین (کتم النفس): بریتی یە لە داخستنی ڕێڕەوی هەوا (دەمولوت)، بە هەر هۆیەك بێت.

٢ – گوشارخستنە سەر قوڕگ (الضغط علی الرقبة):- ئەم جۆرانەیە:

أ – خنکاندن بە پەت: پەتێك بە توندی دەپێچرێ لە ملی قوربانیەکەو، هەناسەدانی دەوەستێنێ.

ب – خنکان بە هەڵواسین: پەتێك دەخرێتە ملی قوربانیەکەو، پێی هەڵدەواسرێ‌و، بە هۆی بارستایی لاشەیەوە پەتەکە لە ملیدا توند دەبێت‌و، ڕێگای هاتوچۆی هەوا دادەخات‌و، بە مردن کۆتایی دێت.

ج – خنکاندن بە دەست: ئەو کاتە ڕودەدات کەسێك قورگی کەسێکی تر بگرێت‌و، ڕێ لە هەناسەدانی ببڕێت‌و، خانەکان ئۆکسجینی بۆ نەچێت‌و، بمرێت.

٣ – هەڵمژینی شتێکی نامۆ: ئەم جۆرانەیە:

أ – شت پەڕینە قورگ: گیرانی ڕێڕەوی هەوایە لە ناوەوە، ڕێگای چونە ناوەوەی ئۆکسجین بۆ سیەکان دادەخات، بەمەش ڕێگای پرۆسەی هەناسەدان دەگرێت. وەك تۆوی میوەو، دانەوێڵەو، بزمار...هتد، کە دەبێتە هۆی مردن.

ب – خنکان بە نوقمبوون لە ئاودا (الغرق): بریتی یە لە ئاو چونە ناو ڕێڕەوی هەناسەدان، بە شێوەیەك هاتوچۆی هەناسەدان بگرێت.

ج – خنکان بە گازی ژەهراوی: ڕۆشتنە ناوەوەی گازی زیانبەخشە بۆ ناو کۆئەندامی هەناسەدان، وەك گازی خەڵوز (یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن)، ڕێژەی ئۆکسجین کەم دەکاتەوەو، دەبێتە هۆی مردن.

**ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە خنکاندا:**

پزیشکی دادیی لە ڕوداوی خنکاندا ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕوون دەکاتەوە:

١ – ئایا مردنەکە بە خنکان بووە ؟ پاش پشکنینێکی وردو، پشت بەستن بە پشکنینی تاقیگەیی، پزیشکی دادیی دەتوانێت ڕونی بکاتەوە ئایا مردنەکە لە بنەڕەتدا بە خنکان بووە، یان بە شتی تر ڕویداوە.

٢ – جۆری خنکانەکە: پزیشکی دادیی بەوەندەوە ناوەستێت بڵێت: مردنەکە بە هۆی خنکانەوە بووە، بەڵکو دیاری دەکات جۆری خنکانەکە بە چی بووە، بە هەناسە لێبڕین بووە، بە پەت بووە، بە گاز بووە، لە ئاودا خنکاوە، ئەو ڕونکردنەوەو وردەکاریانە

پارمەتیدەرێكی باشی لێكۆڵەر دەبێت بۆ دۆزینەوەی تاوانبارو، سەندنی مافی قوربانیو، پیادەكردنی دادپەروەریی.

٣ – جۆری پەتی بەكارهاتوو، پزیشكی دادیی ئەو جۆرە پەتە دیاری دەكات لە خنكاندنەكەدا بەكارهاتووە، گوریس بووە، یان قوماش بووە، یان وایەر بووە، ئەوەش لە دۆزینەوەی تاوانبار نزیكمان دەكاتەوە.

٤ – ئایا خنكانەكە بە زیندویی بووە، یان بە مردویی؟ پزیشكی دادیی دیاری دەكات ئاخۆ مردنەكە بە خنكان بووە، یان بۆ چاوبەست كردن پاش مردنەكە خنكێنراوە، ئەمەش دوو لایەنەیە، هەندێك جار تاوانكار بۆ شاردنەوەی تاوانەكەی دەیكات، پەتێك دەخاتە ملی مردووەكە بە مەبەستی تاوانبار كردنی كەسێكی دیكە. ئەم ڕونكردنەوەی پزیشكە پارێزەری مافی تاكەكانە.

**لقی چوارەم: ژەهراوییوون:**

**یەكەم: پێناسەی ژەهر:**

١ – ژەهر ئەو ماددانەیە بە پێی هەر یاسایەك لە یاسا دان پیانراوەكانی دەرمان لە عێراقدا گەورەترین دۆزی لە یەك جاردا لە نیو گرام كەمترە. (١٣).

٢ – ژەهر ئەو پێكهاتەیەیە ئەگەر بە ڕێژەیەكی كەمیش بچێتە لاشەوە، لەوانەیە لە ڕێی كارلێكی كیمیاییەوە ببێتە هۆی مردن، یان گۆڕانكاری لە فەرمانی ئەندامەكاندا بكاتو، لە كاریان بخات. (١٤).

**دووەم: پۆلێنكردنی ژەهرەكان:**

ژەهرەكان پۆلێن كراون بۆ چەند گروپێك، وەك گازیو، شلو، ڕەق. بەڵام گونجاوترین دابەشكردن بۆ لێكۆڵینەوەی پزیشكی دادیی چۆنیەتی كاریگەریی ژەهرە لەسەر لاشە، كە بەم شێوەیەیە:

## أ - پۆلێنکردنی زانستیانەی ژەهرەکان: ( ١٥ ).

١ – ژەهرە لۆکاڵیەکان: تەنیا بە بەرکەوتنی لاشە کار لە خانەکان دەکاتو، پێستەکە دادەخورێنێو، ڕواڵەتەکەی تێکدەدات، واتە بەر کوێ بکەوێت کاریگەریەکەی لەو شوێنەدا قەتیس دەبێت، ئەم ژەهرانەش بە خۆرە یان سوتێنەر ناویان دەبرێت.

٢ – ئەو ژەهرانەی دوای هەڵمژین کاریگەر دەبن: دوای هەڵمژینیان لە لایەن خانەکانی لەشەوە کاریگەریە ژەهراویەکەیان دەردەکەوێ، کار لە هەموو لاشە دەکەنو، لە یەك شوێندا قەتیس نابن. وەك ژەهری مارو دووپشك.

٣ – ئەو ژەهرانەی کاریگەریان دوو لایەنەیە: واتە کاریگەری لۆکاڵیان هەیەو، کار لە هەموو خانە جیاوازەکانی لەشیش دەکەن. وەك جیوەو زەرنیخ. پێیشیان دەوترێ ژەهرە وروژێنەرەکان.

## ب - پۆلێنکردنی پراکتیکی ژەهرەکان: ( ١٦ ).

١ – ژەهری خۆراك بە ئەنقەست نەبێت: وەك کارلێکردنی خۆراك لەگەڵ کانزای ئەو دەفرەی تێیدا دەکولێنرێ، یان جۆرێ خۆراكو گیاندار خۆیان ژەهراوین وەك جۆرێ ماسیو قارچك (کارگ)، یان خۆراکەکە بە میکرۆب ژەهراوی بوبێت.

٢ – دەرمانو مادەی ئارایشت: دەرمانەکانی چارەسەرو تیمار لە خۆیاندا ژەهرن، بەڵام دۆزەکانیان کەمە، بۆیە کاریگەریان تەنیا لەسەر نەخۆشیەکە یان میکرۆبەکەیە، ئەگەر دۆزەکە زیاتر بکرێت ئەو کات ئێمە لە بەردەم ژەهردا دەبین نەك دەرمان.

٣ – مادده پاکژکەرەوەو مێروو کوژەکان: هەموو مادە پاکژکەرەوەو، خاوێنکەرەوەو، مێروو کوژەکان لە پێکهاتەکانیاندا ماددەی ژەهر هەیە، بۆیە دەبێت لە بەکارهێنانیاندا وریا بین.

٤ – مادده هۆشبەرو سەرخۆشکەرو ئاگاهێنەرەکان: ماددەی ئاگاهێنەر وەك: چای، قاوە، جگەرە، ئەم وروژێنەرانە ماددەی کافائینیان تێدایە، دەزگای دەمار دەوروژێنن و

ڕێژەكەی لە چادا دوو هێندەی ئەو ڕێژمیە لە قاومدا هەیە، هەروەها (تیۆفلینو تیۆبرومینو ترشی تەنیك)یان تێدایە ئەگەر بە كەمیو بە وریاییەوە بەكار بهێنرێن زیانیان نییە، خۆ ئەگەر زیادەڕۆییان تێدا بكرێ دەبنە ژەهر. توتنیش دەچێتە خانەی وروژێنەرەكانەوە، چونكە ماددەی نیكۆتینی تێدایە، كە خۆی ماددەیەكی ژەهرە، ئەگەر لە كاتی جگەرەكێشاندا نیكۆتینەكە نەبوایە بە هەڵمو دەرنەچوایە جگەرەكێش توشی ژەهراویبوونو مردن دەبوو، ئەگەر بە ئەندازەی یەك خاڵ نیكۆتینی پوختی دەرهێنراو لە توتن بەر پێستی مرۆڤ بكەوێت مێشك دەوروژێنێو، دەبێتە هۆی ئیفلیجبوونی گرێی سمپساویو، لە چەند خولكێكدا مردن ڕوو دەدات. لە بەر زیانی جگەرەكێشان لە كوردستان یاسای قەڵاچۆكردنی جگەرەكێشان لە هەرێمی كوردستان ـ عیراقی ژمارە (٣١)ی ساڵی ٢٠٠٧ دەرچوو یاساغی پروپاگەندەی بۆ جگەرەو توتن بە هەموو شێوەیەك كردووە، قەدەغەی جگەرەكێشانی لە شوێنە گشتیەكاندا كردوەو، هەركەس سەرپێچی بكات دەهەزار دینار غەرامە دەكرێت. كحولیش بۆ خۆی ماددەیەكی ژەهرە، زۆربەی كات خواردنەوەی كحول دەبێتە ژەهراویبونی درێژخایەنو، زۆر جار دەبێتە هۆی تێكشكانی زۆرێك لە ئەندامە چالاكەكانی لاشە. كحولی ئەسیلی بە كاریگەرترین كحول دادەنرێت لەسەر ژەهراویكردنی جەستە، چڕی كحولی ئەسیلی لە بیرەدا لە ٤٪و لە ویسكیو مەیدا لە ٤٠ـ ٥٠٪یە، دوای گەشتنی كحول بە خوێن لاشە دەست دەكات بە خۆ لێ ڕزگاركردنی، كحولەكە بە هۆی ئەنزیمی هایدرۆجین لابەر لە جگەردا ئۆكسان دەكاتو، دەگۆڕێت بۆ ئەسیتالدیهایت كە ژەهرێكی زۆری تێدایە. ڕێژەی كەمتر لە (سەدا پێنج) لە خوێندا بەبێ كاریگەر دادەنرێت. بەڵام ڕێژەی زیاتر لە (سەدا پێنج) لە خوێندا دەكەوێتە زۆنی تاوانبارییەوە. دادوەر دەستەڵاتی ئەوەی هەیە سزای تۆمەتبارەكە بدات، یاخود لێی ببورێت، ئەوەش بەپێی بارودۆخی دەستگیركردنی تۆمەتبارەكەو، ڕەفتاری دوای سەرخۆشبوونەكەی.

٥ – ژەهری خشۆكو مێرووەكان: وەك ژەهری مارو دوپشكو هەنگو زەردەواڵە.

**سێیەم: ژەهر و پزیشکی دادیی: (١٧).**

١ – پزیشکی دادیی دەستنیشانی ئەوە دەکات هۆکاری ڕوداوەکە ژەهرە یاخود نە، ئەمەش گرنگی یاسایی هەیە، لەوانەش:

٢ – دەتوانێت جۆری ژەهرەکە دیاری بکات.

٣ – دەتوانێت بڕی ژەهرەکە دیاری بکات.

٤ – دیاریکردنی ماوەی نێوان ژەهراویبوون و، مردنەکە.

**لقی پێنجەم: تاوانە سێکسیەکان:**

کاری سێکسی ئەگەر پایەکانی هاتەدی بە تاوان دادەنرێت، هەندێك لەو لاقەکردنانە لە ڕێی سروشتیەوە دەکرێن وەك زەوتکردن و زینا، هەندێکیشیان لە ڕێی ناسروشتیەوەن وەك پاشبازی. ئەوانەی بایەخ بەم بابەتە دەدەن، کارە بەدڕەوشتیەکانیش (ئابڕوبەر) کە ناگەنە جوتبوون دەخەنە پاڵ تاوانە سێکسیەکان، ئەمەش کورتەیەکیانە: (١٨).

١ – زەوتکردن (الإغتصاب): جوتبوونە لەگەڵ ژنێکدا کە هاوسەر نەبێت، بە بێ ڕەزامەندی.

٢ – زینا: جوتبوونە لەگەڵ ژنێکدا بە ڕەزامەندی خۆی، بەمەرجێك بزانرێ هاوسەردارە. یان ڕۆشتنە لای ژنێکە بە ڕەزامەندی ژنەکە لە ماڵی ژنی پیاوەکەدا.

٣ – پاشبازی: جوتبوونە لەگەڵ کەسێکدا لە پاشەوە، نێر بێ یان مێ.

٤ – کاری ئابڕوبەر: کردارێکە ناگاتە جوتبوون، بەڵام پێچەوانەی ڕەوشتی گشتییە.

**ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە تاوانە سێکسیەکاندا: (١٩).**

أ – ئایا جوتبوون ڕویداوە یاخود ڕوینەداوە؟ پزیشکی دادیی بە گشتی ئاشکرای دەکات جوتبوون ڕویداوە یان نەخێر، -ئەگەر کچ بوو- لە پەردەی کچێتیدا دەردەکەێت، لە

هەمان کاتدا ئەگەر پەردەی کچێتی لاستیکی بوو جوتبوون ئاسەوار بەجێ ناهێڵێ، ئەگەر کەسەکە ژن بوو بە هەمان شێوە، بە مەرجێك سپێرمی تێ نەرژێنرا بێت.

ب – ئایا هیچکامیان توشی نەخۆشی سێکسی بوون؟ چەندین نەخۆشی کوشندەو، گوازراوە لە تاوانی سێکسیەوە دروست دەبێت، پزیشکی دادیی پشکنینیان بۆ دەکاتو، رێوشوێنی پێویست دەگرێتەبەر بۆ زانینی توشبوون، یان توش نەبوون بەو نەخۆشیانە..

ج – ئایا سکپڕی رویداوە؟ ئەگەرچی هیچ نیشانەیەك نەبێتو، پەردەی کچێتیش نەدڕابێت، بەڵام سکپڕی بەڵگەی ئەنجامدانی کارەکەیە، ئەوەش لە رێی تاقیگەوە دیاری دەکرێت.

د – تاوانە سێکسیەکە کەی رویداوە؟ ئەگەر قوربانیەکە کچ بوو پزیشکی دادیی تا دوو هەفتە ماوەی رودانەکەی دیاری دەکات، ئەگەر ژنیش بوو، تا یەك حەفتە بە پاشماوەی سپێرم لە لاشەی ژنەکەدا کاتی رودانەکەی دیاری دەکات.

ه – نیشانەی بەرگریی، پزیشکی دادیی دەتوانێت بەرچاو روونی بدات بە لێکۆڵەرو دادوەر لەسەر بەرگری قوربانیەکە، کە یەکێکە لە نیشانەکانی ناڕازیبوون. ئەمانەش بۆ گەیشتن بە راستییەکان ئەرکی دادوەر ئاسان دەکات.

### لقی شەشەم: ئەشکەنجەدان و بەکارهێنانی هێز:

ئەشکەنجەدان و بەکارهێنانی هێز لە ناچارکردن بۆ دان پیانان جێی بایەخی پزیشکی دادییە، چونکە یاسا بایەخو، گرنگیی پێداوەو، بە تاوانو، پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دایناوە، هەرکات پزیشکی دادیی بوونی ئاسەواری لێدانو ئەشکەنجەو برینی دیاریی کردو، لێکۆڵینەوە ئەوەی سەلماند، دادگا ئەو پێ‌لێنانە وەرناگرێت، چونکە لە ژێر ئەشکەنجەدا وەرگیراوە.

**یەکەم: سەربوردێکی مێژوویی ئەشکە نجەدان:**

**أ – ئەشکەنجەدان لە یاسای کۆنی ڕۆماندا: (٢٠).**

ئەم یاسایە بە دڵڕەقیی ناوبانگی دەرکردبوو، لێرەدا هەندێك لە حوکمەکانی سزادانیان دەخەینە ڕوو تا دەربکەوێت مافی مرۆڤ چەندە پێشێل کراوە تیایدا:

١ – سوتانی مرۆڤ بە زیندویی، سزای ئەوانە بوو کە لە خزمەتی سەربازی هەڵدەهاتن، یان ئەو کۆیلانەی کە ئاغاکانی خۆیان دەکوشت.

٢ – لە خاچدان، سزای ئەوانە بوو کە جەردەو، ڕێگر بوون.

٣ – خستنە بەردەم ئاژەڵی دوڕندە، بۆ ئیعتراف پێکردن بوو.

٤ – سەرپەڕاندن بە شمشێر، سزای ئەوانە بوو حوکمی مردنیان درابوو.

٥ – بە کۆیلە کردن، لە کانەکاندا بە کۆت و پێوەندەوە کاریان پێدەکرا.

٦ – دورخستنەوە، سزای ئەوانە بوو کە مافی هاوڵاتی بونیان لێ دەسەنرا.

ئەم ڕەوشە تا سەدەی هەژدە بەردەوام بوو، لەوە بە دواوە لە ژێر کاریگەریی نوسینەکانی (بیکاریاو، مۆنتسکیوو، دردیرو، ڕۆسۆ...هتد) دەستی لێ هەڵگیرا. ساڵی ١٧٤٠ی زایینی پاشا فەردریك لە برۆسیا (ئەڵمانیا) سزای لابردو، ساڵی ١٧٦٩ز کاترینی دووەم ئیمپراتۆری ڕوسیا هەمان هەنگاوی ناو، ساڵی ١٧٧٧ز گۆستاف پاشای سوید بە هەمان شێوەو، ساڵی ١٧٨٠ز لویسی شازدەیەم لە فەرەنسا یاسا کۆنەکانی سزادانی هەڵوەشاندەوە. ئەگەر چی لە یاسادا سزادان نەما، بەڵام لە زۆر شوێن هەر بەردەوام بوو، بە تایبەت لە ئەڵمانیای نازیو، ڕوسیاو، سیستەمە چەپەکان ئەشکەنجەدان بەکاردێنن.

**ب – ئەشكەنجەدان لە ئیسلامدا:**

**خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بایەخێكی زۆری بە مرۆڤ داوەو، ڕێزی لێ گرتووە. لە ئایەتی ۷۰ی سورەتی الاسراءدا دەفەرموێ:** ﴿ وَلَقَد كَرَّمنا بَنی ئَادَمَ وَحَمَلناهُم فِي البَرِّ وَالبَحرِ وَرَزَقناهُم مِنَ الطَّيباتِ وفَضَلناهُم على كَثيرٍ ممَن خَلَقنا تَفضيلا ﴾. **لە هەمان كاتدا خوای گەورە دوو شت ڕادەگەیەنێت، یەكەم: نابێت زۆر لە هیچ كەس بكرێت بۆ ئەوەی باوەڕ بە ئیسلام بێنێت، چونكە هەموو دان پیانانێكی بە زۆر بێبنەماو پوچە، بۆیە لە ئایەتی ۲۵٦ی سورەتی البقرەدا دەفەرموێ:** ﴿ لا إكراهَ في الدِّينِ قَد تَبَيَنَ الرُشدُ مِنَ الغَيِّ... ﴾. **لە هەمان كاتدا ئەگەر زۆر كرا لە موسڵمانێك لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە، قورئانی پیرۆز بایەخی بۆ دانانێت، چونكە ویستو ئیرادەی زەوت كراوە، ئەوەتە لە ئایەتی ۱۰٦ی سورەتی النحل دا دەفەرموێ:** ﴿ مَن كَفَرَ باللّهِ مِن بَعدِ إيمانِهِ إِلَّا مَن أُكرِهَ وَقَلبُهُ مُطمَئِنٌ بالإيمان... ﴾. **پێغەمبەر – درودی خوای لەسەر- دەفەرموێ: ﴿ مرۆڤ دروستكراوی خوایە، نەفرەت لەو كەسەی دروستكراوی خوا دەڕوخێنێ ﴾. ئیمامی عومەر دەڵێ: ﴿ مرۆڤ دڵنیا نابێت لەسەر ژیانی ئەگەر ئازار درا، یان لێدان كرا، یان بەسترایەوە ﴾. جەماوەری زانایانی موسڵمان لەسەر ئەوە هاوڕان دروست نییە هیچ كەس بەزۆر لێكردن ناچار بكرێت بۆ ئیعتراف كردن. (۲۱).**

**ج – ئەشكەنجەدان لە جاڕنامەكانی مافی مرۆڤدا :**

**۱ – لە مادەی پێنجەمی جاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤی ساڵی ۱۹٤۸ز دەڵێ: هیچ مرۆڤێك ئەشكەنجەو، سزاو، مامەڵەیەكی توندو نامرۆڤانەی وای لەگەڵدا ناكرێت، كە ڕێزی دابەزێنێت. (۲۲).**

**۲ – لە برگەی (أ)ی مادەی شەشی ڕاگەیاندنی مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا دەڵێ: نابێت تاوانباریش ئەشكەنجە بدرێت، چ جای تۆمەتبار، هەروەها نابێت هیچ كەسێك ناچار بكرێت ددان بنێت بە تاوانێكدا كە نەیكردوە، هەر زانیاریەكیش بە زۆر لە تۆمەتبار دەربهێنرێت پوچو باتڵە. (۲۳).**

٣ – لە دەستوری عێراقدا، لە برگەی (ج)ی مادەی (٣٧)ی دەستوری کۆماری عێراقی ٢٠٠٥دا دەبێژێ: هەموو ئەشکەنجەدانێکی دەروونیو جەستەییو، مامەڵەیەکی نامرۆڤانە یاساغەو، هەر دان پیانانێك بە زۆرو هەڕەشەو ئەشکەنجە دەربهێنرێت بایەخی نییەو، زیان لێکەوتوو بۆی هەیە بە پێی یاسا داوای قەرەبووی ئەو زیانە ماددیو مەعنەویە بکات کە لێی کەوتووە.

**دووەم: ئەو کارانەی بە ئەشکە نجە دادەنرێن : ( ٢٤ ).**

ئەشکەنجەدان هەموو ئازاردانێکی لاشەو، هەڵسوکەوتێکی توندو تیژو نامرۆڤانە دەگرێتەوە کە لەگەڵ تۆمەتباردا بە مەبەستی ناڕەحەتکردنو، پێوناڵاندنی ئەنجام بدرێت. وەك:کۆتکردن پێوەندکردن، کەلەبچەکردن، لێدان بە شەقو زللەو قامچیو دار، دانانی بە کورپە (قنجە) بۆ ماوەیەکی زۆر، لغاو لەدەم کردن، توکەسەر ڕاکێشان، گوێ ڕاکێشان، خستنە ناو ئاو، تەزوی کارەبا لێدانو، سەگ تێبەردان. ئەو کارانەیش ڕێزو شکۆمەندی مرۆڤ بشکێنێ، یان ئازاری دەروونیی پێبگەیەنێ، بە توندوتیژی دادەنرێن.

**سێیەم: پزیشکی دادیو ئەشکە نجەدان: ( ٢٥ ).**

رۆڵی پزیشکی دادیی خۆی لە ئاشکراکردنو، دۆزینەوەی شوێنەواری ئەشکەنجەدان دەبینێتەوە، ئەوەش لە میانەی پشکنینی جەستەی قوربانیەکەوە دەتوانێت ئەمانە دیاری بکات:

١ – بەرواری ئەشکەنجەدانەکە بە نزیککراوەیی.

٢ – دیاریکردنی ئامێری بەکارهاتوو لە ئەشکەنجەداندا.

٣ – ناسینەوەی بەکارهێنانی کۆتو پێوەند.

٤ – ناسینەوەی ئەشکەنجەدان بە هەڵواسین.

٥ – ئاشکرا کردنی بڕینو پسانی دەمار.

٦ – دیاریکردنی سزادان به کارەبا.

٧ – دیاریکردنی بەکارهێنانی زللەو شەق و قامچیو گۆچان.

٨ – دیاریکردنی ئەشکەنجەدان به سوتاندنو داخکردن.

٩ – دیاریکردنی ئەشکەنجەدان به نینۆك دەرهێنان.

١٠ – دیاریکردنی کاری سێکسی کردن لەگەڵ تۆمەتباردا.

لێرەدا راپۆرتی پزیشکی بەرچاو روونی تەواو به دادوەرو پارێزەری تۆمەتبارەکه دەدات، تا بزانن ئەو دان پیانانه به زۆر وەرگیراوەو، هیچ بایەخێکی یاسایی نییەو، دەتوانرێت لایەنی دەستدرێژکار توشی لێپێچینەوە بکرێت. بەم شێوە پزیشکی دادیی پارێزەرەی مافی هاوڵاتیانه.

# تەوەری دووەم: پشکنینی تاقیگەیی:

## لقی یەکەم: پشکنینی پەڵەی خوێن:

پێویستیەکانی لێکۆڵینەوە لێکۆڵەر ناچار دەکات بۆ ناساندنی سروشتی پەڵە دۆزراوەکانی سەر پۆشاكو جلوبەرگو، جەستەی تۆمەتبارو، جێگای ڕودانی تاوانەکە، یان ئامڕازە بەکار هاتووەکە بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی بە ڕوداوەکەوە، پشت بە پزیشکی دادیی ببەستێت، چونکە ناکرێت بە بێ پشکنینی تاقیگەیی قسەی یەکلاکەرەوەی تێدا بکرێت، بۆیە کاتێك پەڵەیەکی خوێناوی لەسەر پۆشاکێك، یان شوێنێکی ناوماڵدا دەدۆزرێتەوە، داوا لە پزیشکی دادیی دەکرێت پشکنینی بۆ بکات، بۆ دیاریکردنی سەرچاوەکەیو، جۆرەکەی، تا بەراورد بکرێت لە نێوان خوێنی قوربانیەکەو، ئەو خوێنەی کە بە تۆمەتبارەوەیە. زۆر جار ناتوانرێت بە ڕواڵەتی دەرەوە خوێن بناسرێتەوە، بۆیە لەو کاتەدا دەبێت پشت بە پشکنینی تاقیگەیی ببەسترێت، چونکە دەکرێت خوێنێك – ئەگەر سروشتی خۆی لە دەست نەدابێت- دەیان ساڵ بەسەریدا تێپەڕیبێ بناسرێتەوە. ( ٢٦). ئەو پەڵانەی لە کارێکی تاوانکاریدا بە جێدەهێڵرێن زۆرن وەك: پەڵەی خوێن، یان سپێرم، یان لیكوتف، یان تۆزوقوڕ، هەر هەموو گرنگن، بەڵام لە هەموویان گرنگتر پەڵەی خوێنە. ئەگەرچی ڕەنگی خوێن لای هەمووان ناسراوە، بەڵام تەنیا ئەوە وەك بەڵگەیەك بەس نییە، چونکە چەندین شتی تر هەیە لە شێوەدا وەك خوێن دەردەکەون، وەك: ئاوی میوە، ژەنگی ئاسن، ڕەنگی هەندێك بۆیاخ. بۆیە پێویستە پشکنین بۆ پەڵەکان بکرێت، تا پەڵەی خوێن لە شتەکانی تر جیا بکرێتەوە.

### یەکەم: گروپەکانی خوێن: ( ٢٧ ).

وەك دەستپێك بۆ ئەوەی بزانرێت تاقیگە بۆ ناسینەوەی کەسەکان لە ڕێگای خوێنەوە پشت بە زانست دەبەستێتو، ڕێبازی زانستیی پیادە دەکات. جۆری خوێنی مرۆڤ دەکرێت بە چوار گروپەوە (A،B،AB،O)، ئەم پۆلێن کردنەش پشت بە بوون یان نەبوونی (Antigens) دەبەستێت لەسەر خڕۆکە سورەکانو، بوونو نەبوونی دژە تەن (Antibodies) لە پلازمای خوێندا. بۆیە ناتوانرێت خوێن لەکەسێکەوە بگوازرێتەوە بۆ

کەسێکی تر ئەگەر هەردوو جۆرە پشکنینەکەیان بۆ نەکرێت و، دووپاتی ئەوە نەکرێتەوە ڕێگر نیە لە گواستنەوەی خوێنەکەدا، ئەگەر وانەبوو کەسەکە دەمرێت. لە ساڵی ١٩٠٠ زانایەکی نەمساوی بەناوی (کارل لاند شتاینەر) یەکەم کەس بوو گروپەکانی خوێنی دۆزیەوەو، لە ساڵی ١٩٣٠ خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا. لەو کاتە بەدواوە مرۆڤەکان بە گوێرەی گروپی خوێن جیاکرانەوەو، لەو ڕێگایەشەوە ڕەچەڵەک و، تاوانە جیاوازەکانی پێ جیا دەکرێتەوە. پاش ئەوە گروپەکانی خوێن لە سپێرم و، لیکدا دۆزرانەوە. لە ساڵی ١٩١٠ دوو زانا ئەوەیان دۆزیەوە کە گروپی ( A) دوو جۆرە، A یەک و A دوو، واتە بەم شێوە دەبێت: A1،A2 ،AB1 ، AB2 ، B،Q پاشان چەند گروپێکی دیکە دۆزرانەوە وەک: Lutheran، Lewis، Duffy، Kidd،MN . لە ساڵی ١٩٢٧ گروپێکی سیانی پلازما دۆزرانەوە وەک: GM، GC،Hoptoglobin . لە ساڵی ١٩٣٧ خوێن دابەشکرا بۆ( RH) پۆزەتیڤ و، ( RH) نێگەتیف، واتە هەموو گروپەکان پۆزەتیڤ و، نێگەتیڤیان هەیە. بەم شێوە گروپەکانی خوێن زۆر بوون، لە هەمان کاتدا سودی فریاکەوتن و، لێکۆڵینەوەشی زیادی کرد. چەندین جۆری تر لە ناو پلازماو، خڕۆکە سپیەکاندا دۆزرانەوە. ئیتر ژمارەی پشکنینی خوێنیش زۆر زۆر بوون، تا لەم سەردەمەدا گەیشتووەتە زیاتر لە (١٧٠) گروپ .

**دووەم: گروپی خوێن و پزیشکی دادیی:** پزیشکی دادیی دەتوانێت لەم ڕێگایەوە ئەم خزمەتانە بکات: (٢٨).

١ – ئەوە دیاری دەکات ئایا پەڵەی دیاریکراو خوێنە، یان شتی ترە.

٢ – ئایا سەرچاوەی پەڵە خوێنەکە مرۆڤە، یان ئاژەڵ.

٣ – دیاریکردنی خاوەنی پەڵە خوێنەکە لە تاوانەکەدا.

٤ – بۆ سەلماندنی ڕەچەڵەکی منداڵێک کاتێک ژنێک بانگەشەی ئەوە دەکات منداڵەکەی لە پیاوێکی دیاریکراوە. یان باوک و دایکێک بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو منداڵە منداڵی ئەوانە، ئەوەی پێدەسەلمێنرێ، ئەو منداڵە لەو باوک و دایکە نییە.

٥ – بۆ جیاکردنەوەی منالێ له نەخۆشخانه لەگەڵ منالانی دیکەدا تێکەڵ دەبێت، له پرۆسەی ناسینەوەی ڕەچەڵەکی منالێ دەبێت پشکنینی خوێن بۆ منالەکەو، باوك‌و، دایکیشی بکرێت.

٦ – بۆ دۆزینەوەی تاوانه سێکسیەکان به دیاریکردنی گروپی سپێرم له ڕێی خوێنەوە، جاران ٨٥٪ی پێ دەدۆزرایەوە، بەڵام ئێستا به هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە له ڕێی ئەنزایمەکان‌و، ترشی بۆ ماوەیی (D.N.A) له ١٠٠٪ی خاوەنەکانی دەدۆزرێنەوە.

**لقی دووەم: پشکنینی سپێرم:** (٢٩).

له زۆربەی جارەکاندا لەگەڵ دەستدرێژیی سێکسیدا سپێرم دەرژێت‌و، لەسەر پۆشاك یاخود جەستەی تۆمەتبار، یان قوربانی، یان هەردووکیان بەجێ دەمێنێ، به تایبەت له نزیك ئەندامی زاوزێ‌و، ناوچەی کۆم و، ناوی کۆم‌و زێ.

بڕی قەبارەی سپێرم له یەك جاردا له نێوان (٥-٢,٥)سم٣ دەبێت‌و، له هەر سانتیمەتر سێ جادا ٦٠-١٥٠ ملیۆن گیانداری سپێرمی تێدایه.

**ڕواڵەتی سپێرم:**

١/ پەڵەی تەڕ: شلەیەکی لینجه، وەك هێلم‌و جەلاتینه، ڕەنگی زەردێکی تۆخ یاخود خۆڵەمێشیه، بۆنێکی تیژی وەك کلۆر یاخود بۆنی هەویر، یان بۆنی گۆشتی کاڵی هەیه. له ماوەی چەند خولەکێکدا له گەرمای ئاساییدا دەتوێتەوە.

٢/ پەڵەی وشك: پێکهاتەی نیشاستەییه، ڕەنگی زەردێکی کاڵه، شێوەی نەخشه وەردەگرێت‌و، زۆر ناسکەو زوو دەشکێت، بۆیه دەبێت به وریایی بخرێته قوتووەوە بۆ ئەوەی نەشکێت.

**دەستنیشان کردنی خاوەنی سپێرمەکه:**

له ڕێگای بەکارهێنانی گروپەکانی خوێنەوە دەتوانرێت له ٨٥٪ی گروپی سپێرم دیاری بکرێت، لەو حاڵەتانەی به ڕژێنەر (Secretors) دادەنرێت، له کاتێکدا له ١٥٪ی

کەسەکان ئەو گروپانە نارژێنن. توێژینەوە لەسەر گروپی سپێرم توێژینەوەیەکی سەختو ماندوکەرو، پێویستیی بە لێهاتنێکی تایبەتی هەیە، بۆیە لە هەندێك حاڵەتدا نەبێت پەنای بۆ نابرێت. (یاماکامی) یابانی دەڵێ: ئەگەر سامپڵێك سپێرمی پوخت (سەنتەر فیوج کراو)، تێکەڵ بە سیرەمی گروپە جیاوازەکانی خوێن بکرێت، ڕەگەزێکی تێدایە دەتوانێت گروپە جیاوازەکانی سپێرمی خوێنەکە بوەستێنێ (inhibition). بەو مانایە دژی ئەو ئەگلوتینین (تۆپەڵ) (Anti Agglutinins)ی تێدایە کە لە سیرەمەکەدا هەیە، سپێرمی هەموو کەسێك بە ڕێژەی جیاواز ماددەی دژە ئەگلۆتینینی تێدایە، (یاماکامی) دەڵێ: ئەم دژەتەنانە ئەوەندە بە هێزن بۆ شیبوونەوە بەرگەی سەد پلەی سەدیی گەرمی دەگرن، بۆیە دەتوانرێت دوای چوار مانگ ئەم دژەتەنە لە سپێرمی وشکبووەدا بدۆزرێتەوە. ئەم نوسینە جێگای شێوەی دۆزینەوەی گروپی سپێرمەکە نییە.

### کاری پزیشکی دادیی لە بواری سپێرمدا:

١ – جیاکردنەوەی سەرچاوەی سپێرمەکە مرۆڤە، یان ئاژەڵ.

٢ – دیاریکردنی سەرچاوەی سپێرمەکە بە بەراورد کردنی لەگەڵ سپێرمی تۆمەتباردا، بە گوێرەی چوار گروپەکەی خوێن سپێرمیش پۆلێن دەکرێت.

٣ – دیاریکردنی خاوەنی سپێرمەکەو، دۆزینەوەی تاوانبار. بەهۆی سپێرمەوە لە ٨٥٪ی گروپەکان دیاری دەکرێن، ئێستا لە ڕێی (D.N.A) لە ١٠٠٪ی خاوەنی سپێرمەکە دەستنیشان دەکرێت، بۆیە پەنا بۆ شێوازی خوێن نابرێت چونکە گرانو سەختە.

### لقی سێیەم: پشکنینی ڕیشاڵ و موو: (٣٠).

زۆرجار پشکنینی قژ دەمانگەیەنێتە دۆزینەوەی تاوانبار، یان دەرخستنی بێتاوانی تۆمەتبار، گرنگیی پشکنینی قژ لە لایەن پزیشکی دادییەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدایە:

١ – دەستنیشان کردنی سەرچاوەی قژەکە (مووەکە) هی مرۆڤە، یان ئاژەڵ.

٢ – دیاریکردنی شوێنی مووەکە لە جەستەدا.

٣ – دیاریکردنی چۆنیەتی لێکردنەوەی مووەکە، بڕاوە یان هەڵکێشراوە.

٤ – دیاریکردنی ماوەی لێکردنەوەی مووەکە.

٥ – دیاریکردنی تەمەنی خاوەنی مووەکە بە نزیککراوەیی.

٦ – پزیشکی دادیی دەتوانێت بە دڵنیاییەوە بڵێت: ئەو قژە هی ئەو کەسە نییە.

بێگومان لە ڕێی ئەو خاڵانەی سەرەوە بێ تاوانیی هەندێك تۆمەتبار دەسەلێ‌و، دەشبێتە گرینەیەکی یاسایی بۆ تاوانبارکردنی هەندێکی دیکە. بۆیە دەکرێت لە ڕێی تاڵە موویەکەوە تاوانبارێك بدۆزرێتەوە، یان بێتاوانی کەسێك دەربکەوێت. لێرەدا ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە دابینکردنی دادپەروەریدا دەردەکەوێت.

**لقی چوارەم: چۆنیەتی ناردنی پەڵەکان بۆ پشکنینی تاقیگەیی:** ( ٣١ ).

بۆ دەستخستنی ئەنجامێکی دروستی شیکاری تاقیگەیی‌و، بۆ پاراستنی سامپڵەکان لە دەستکاری کردن پێویستە ئەم ڕێوشوێنانە بگیرێنەبەر:

١ – ئەو ماددەیەی گومان هەیە لە پیسبونی بە خوێن‌و سپێرم، دەبێت بەشێوەیەکی وشك ڕەوانەی تاقیگە بکرێت، تا لە بۆگەنبوون بپارێزرێت، چونکە لەو بارەدا هەندێك جار ئاستەمە پشکنینی تاقیگەیی بۆ بکرێت، ماددە پیسبووەکان بە خوێن‌و سپێرم ئەگەر تەڕبوون دەدرێنە بەر هەوای ئازاد تا وشك دەبنەوەو، نابێت هیچ ئامرازێك بەکار بهێنرێت بۆ وشککردنەوەیان‌و، نابێت بدرێنە بەر ئاگرو، نابێت ئوتو بکرێن‌و، باشتر وایە نەدرێنە بەر خۆریش.

بەڵام پارچە ئەندامیەکان – پارچە شانەیەك گومان بکرێت لاشەی مرۆڤە- بۆ پاراستنی لە گەنین هەموو پارچەکە لە کحولدا نقوم بکرێت‌و، بۆ دەرنەچوونی ماددە پارێزەرەکەی لە ناو قوتویەکدا دەنێردرێ کە باش دابخرێت‌و، سەری قوتوەکە مۆر بکرێت.

٢ هەرماددەیەك دەویسترێ پشکنینی بۆ بکرێت، باشتر وایە هەمووی ڕەوانە بکرێت‌و، هیچی لێ نەکرێتەوە، ئەگەر ناچار بوون بۆ لێکردنەوەی پارچەیەك ، لێکۆڵەر

ئازادە چ ڕێگایەك بەكار دێنێ، وەك كرِاندنی پەڵەكە، یاخود بڕینی قژە پیسبووەكە، یان تواندنەوەی پەڵەكە بەم شێوەیەی خوارەوە: پارچە شاشێكی بەكار نەهاتوو بە ئاوی دلۆپاو تەڕ دەكرێتو، دەخرێتە سەر پەڵەكە تا بەر هەمووی دەكەوێتو، بۆ چەند خولەكێك دەهێڵرێتەوە تا ڕیشاڵەكان ڕەنگی پەڵەكە هەڵدەمژنو، ڕەنگی دەگرن، پاشان پارچە شاشەكە وشك دەكرێتەوەو، دەنێردرێ بۆ تاقیگە.

٣ – نابێت چواردەوری ناوچە پیسبووەكە بە بۆیاخ یان مرەكەب دیاری بكرێت، بەڵكو پەڕەیەك دەخرێتە سەر شوێنی پەڵە پیسبووەكەو، ئەو شتەی لێكۆڵەر بیەوێت ڕونكردنەوەی لەبارەوە بدات بۆ تاقیگە لەسەری دەنوسێت.

٤ – هەر ماددەیەك دەنێردرێ بۆ تاقیگە بە بەرگێك – لێكۆڵەر چی پێ باشە- بە باشی بپێچرێتەوە بە شێوەك دەستی بەرنەكەوێت، بە پەتێك ببەسترێتو، مۆربكرێت بۆ ئەوەی ڕێ بگیرێت لە هەر دەستكارییەك بویسترێ بكرێت.

٥ – كاغەزێكی لێ دەپێچرێو، ناونیشانی ئەو لایەنە فەرمیەی كە بۆی ڕەوانە دەكرێتو، سەرچاوەی لێكۆڵینەوەو بەروارو ژمارەی نوسراوەكەشی لەسەر دەنوسرێت.

٦ – لەگەڵ هاوپێچەكەدا نوسراوێك ڕەوانە دەكرێت، كورتەی ڕوداوەكەو جۆری پشكنینی داواكراوی تێدا دەنوسرێتو، بە نوێنەری لایەنی لێكۆڵینەوەدا دەنێردرێت بۆ تاقیگەی پسپۆڕو پەیوەندیدار.

### لقی پێنجەم: پشكنینی ماددەی هۆشبەرو سەرخۆشكەر:

ماددە هۆشبەرەكان كۆمەڵێك ماددەی ڕووەكیی یان نیمچە دەستكرد یان دەستكردن، ئالودەبوون پێیانەوە كەسەكە ناچار دەكات بە ناچاریی بە بەردەوامی بەكاری بهێنێت، لە ڕێكەوتنە نێو دەوڵەتیەكانو، یاسا ناوخۆیەكاندا دیاریو یاساغ كراون، وەك: (الإتفاقية الوحيدة للمخدرات لسنة ١٩٦١، بصيغتها المعدلة ببروتوكول سنة ١٩٧٢، في مؤتمر الأمم المتحدة لسنة ١٩٧٢). و ( لیژنەی قەڵاچۆكردنی ماددە هۆشبەرەكان بۆ ساڵی ١٩٩٥ كۆبونەوەكانی خولی سیوهەشتەمینی لە نەمسا گرێداو، باسی ئەو ڕێگا چارانەی كرد كە

هاریکاری نێودەوڵەتی لە بواری قەڵاچۆکردنی خراپ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەستەبەر دەکات...).(٣٢). ﴿یاسای ژمارە ٦٨ی ساڵی ١٩٦٥ی مادده هۆشبەرەکان، کە بە یاسای ژمارە ١٤٤ی ١٩٧٩ هەموار کراوەو، یاسای هەموارکردنی سێیەمی ژمارە ٣٨ لە بەرواری ٢٠٠٢/٩/٧، ماددەی هۆشبەرو، جۆرەکانیو، سزاکانی بەکارهێنانو بازرگانی پێوەکردنی دیاری کردوەو، دەڵێ: ماددەی هۆشبەر هەموو ئەو مادده سروشتیو دروستکراوانەن کە لە خشتەی هاوپێچی یاساکەدا هاتوون. – خشتەی یەکەم (٨٠) ماددەو، خشتەی دووەم (٨) ماددەو، خشتەی سێیەم (٥) ماددەو، خشتەی چوارەم (٤) مادده لە خۆ دەگرێت – سزاکەی دەگاتە زیندانی هەتاهەتایی لەگەڵ کاری قورس، یان ئیعدام کردن﴾. (٣٣). وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستانیش بە بەیانی ژمارە (٧١)ی ساڵی ٢٠١٢ کە لە ژمارە (١٤٧) وەقایعی کوردستان لە بەرواری ٢٠١٢/٧/١ بڵاو کراوەتەوە، ئەم ماددانەی زیاد کردوە بۆ خشتەکانی یاساکە. واتە بە ماددەی هۆشبەر داینراون- مادده زیاد کراوەکانیش ئەمانەن: ﴿ ١- ئەمفیتامین، ٢- ترامادۆل، ٣- سۆمادریل، ٤- تارتان، ٥- ڤالیۆم، ٦- شروبی باڵمۆ کە کۆداینی تێدایە، ٧- شروبی توسیرام کە کۆداینی تێدایە﴾.

مادده سەرخۆشکەرەکانیش لە چەند وڵاتێکدا بە یاسا قەدەغە کراون، لە وڵاتانی دیکەدا بە یاسا رێکخراون، لە هەندێ کاتو، هەندێ شوێنو، هەندێ کاردا بەکارهێنانی قەدەغەیە، وەك: کاتی ئەنجامدانی ئەرکی فەرمییو، لە شوێنی گشتیداو، لە کاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلدا. بڕگەی (١)ی ماددەی (٢٢)ی یاسای هاتوچۆی ژمارە (٨٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ دەڵێ: هەرکەس لە ژێر کاریگەری ماددەی سەرخۆشکەرو هۆشبەردا ئۆتۆمبێل لێبخوڕێت، بەند دەکرێت بۆ ماوەی لە سێ مانگ کەمتر نەبێتو لە ساڵێك زیاتر نەبێت، یان غەرامە دەکرێت لە سێسەد هەزار دینار کەمتر نەبێتو لە پێنجسەد هەزار دینار زیاتر نەبێت. یان هەردوو سزاکە بدرێت لەگەڵ ڕاگرتنی ئۆتۆمبێلەکە بۆ ماوەی ساڵێكو، دەتوانرێت مۆڵەتی شۆفێریەکەی لێ وەربگیرێتەوە بۆ ماوەی لە دوو مانگ کەمتر نەبێتو لە ساڵێك زیاتر نەبێت. کحول کە بە کوردی پێی دەوترێ (مەی) لە لایەنی پزیشکیەوە کار لە سەنتەری کۆئەندامی دەمار (مێشك) دەکاتو، لە لایەنی پراکتیکیشەوە کاریگەریی مەی دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە فەرمانەکانی مێشکدا. (٣٤). بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی

بەکارهێنەری ماددەی هۆشبەرو مەی کۆنترۆڵی خۆی پێ نەکرێتو، چەندین تاوان ئەنجام بدات. سەرژمێرییەك لە فەرەنسا باس لەوە دەکات لە ٦٣٪ی دەستدرێژیکردنە سەر خەڵكو، لە ٥٦٪ی تاوانە سێکسیەکان بۆ کاریگەریی مەی خواردنەوە دەگەڕێنەوە. (٣٥).

**ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە ماددە سڕکەرەکاندا:**

لە تاقیگەکانی پزیشکی دادییدا لە ڕێی میزو خوێنەوە پشکنین دەکرێت بۆ دەرخستنی بوونو، نەبوونی ماددەی هۆشبەرو سەرخۆشکەر (مەی) لە جەستەی ئەوانەی گومان دەکرێت بەکاریان هێنابێت. ڕێژەکەشی لە جەستەی بەکارهێنەردا دیاری دەکرێت، ئەمەش دەبێتە بەڵگەی یاسایی بۆ تاوانبارکردن، یان بێتاوانکردنی کەسی گومان لێکراو. لێرەدا ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە پاراستنی مافو، دادپەروەریدا زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت.

## تەوەری سێیەم: مردن‌و توێکاریی تەرمی مردوو له ئیسلامدا:

### لقی یەکەم: مردن‌و پزیشکی دادیی:

**یەکەم: مردن چی یه ؟**

١ – مردن بەوە پێناسە دەکرێت: وەستانی زیندە چالاکیەکانی جەستەیە، کە وەستانی هەناسەدان‌و دڵ‌و سوڕی خوێن‌و کۆئەندامی دەمار دەگرێتەوە، بە شێوەیەك ئاستەمە ئەو کۆئەندامانە لە خۆیانەوە بکەونەوە کارکردن. (٣٦).

٢ – مردن وەستانی ژیانە، ئەوەش مردنی جەستەیە، کە کۆئەندامەکانی لاشە کارەکانیان جێبەجێ ناکەن. (٣٧).

**دووەم: جۆرەکانی مردن: (٣٨).**

١ – مردنی سروشتی، وەك مردن بە هۆی نەخۆشیی یان پیریی.

٢ – مردن بە خۆکوژیی.

٣ – مردن بە هۆی تاوانکاریی، وەك سەربڕین ئەمە دیارە، بەڵام هەندێك هۆکاری مردن دیار نین وەك ژەهراویبوون، یان برینی ناوەکی نادیار، لەم بارەدا پزیشکی دادیی ڕۆڵی گەورەی هەیە لە دیاریکردنی هۆو باری مردنەکە. لە ئەنجامدا ڕۆڵیشی دەبێت لە جوڵاندنی داوای گشتی‌و ئاراستەکردنیدا.

**سێیەم: پێناسەی توێکاریی: (٣٩).**

کردنەوەو توێکردنی تەرمی مردووە، یان توێکردنی پارچەیەکیەتی لە لایەن پزیشکان‌و شارەزایان بۆ بەرژەوەندی زیندوەکان یان مردووەکان یان هەردووکیان، بە ڕەچاوکردنی مەرجە شەرعیەکان.

## چوارەم: جۆرەکانی توێکاریی: (٤٠).

١ – توێکاریی تاوانکاریی: توێکاریکردنی تەرمە لە کاتی بوونی گومانی تاوان لە مردنێکدا، تا بزانرێت مردنەکە لە ئەنجامی دەستدرێژیدا ڕویداوە... ئەگەر بوونی تاوان ئاشکرا بوو، دەست دەکرێت بە گەڕان بە شوێن بوونی نیشانەکان لە تۆمەتباردا..

٢ – توێکاری نەخۆشیی: بۆ زانینی نەخۆشیەکانو جۆرەکانیانو کاریگەریان لەسەر ژیانی مرۆڤو، ئایا ئەو نەخۆشیە دەتەنێتەوە یان نە .

٣ – توێکاریی فێرکاریی: قوتابیانی کۆلیژی پزیشکی بە مەبەستی فێربوونی زانستیی توێکاریی تەرم دەکەن بۆ زانینی چۆنیەتی پێکهاتەی کۆئەندامەکانو فەرمانەکانی لەشی مرۆڤ.

٤ – توێکاریی بە مەبەستی چاندنی ئەندامەکان: کاتێك مرۆڤێك لە ژیاندا بڕیار دەدات پاش مردن پارچەیەکی لەشی ببەخشێت،، ڕێگا دەدات پزیشکەکان ئەو پارچەی لێ ببڕنو، بیدەن بەو کەسەی پێویستیەتی.

## پێنجەم: مەبەست لە توێکاریی تەرم چی یە؟ (٤١).

هەموو ئەو مردووانەی گومان لە مردنەکەیاندا هەیە بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە، پێویستیان بە توێکاریی هەیە.

١ – زانینی هۆکاری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی مردنەکە، واتە: ئایا ئەو زیانەی بە لاشەکە گەیشتووە بە تەنیا بەس بووە بۆ ڕودانی مردن، وەك خوێن بەربونی مێشك. یان ئەو زیان پێگەیاندنە بە تەنیا نابێتە هۆی مردن ئەگەر هۆکاری دیکەی لەگەڵ نەبێت.

٢ – دیاریکردنی بەرپرسیارێتی کاراکتەرەکە: ئەو بەڵگە زانستییەی پزیشك پێشکەشی دەکات دەبێتە بەرچاو ڕوونی بۆ دادوەر لە بڕیار دەرکردندا، وەك تاوانبارکردنو سزادان، یان سوك کردنی سزا، یان بێتاوان دەرکردنی تۆمەتبار.

٣ – کەمتەرخەمی لە چارەسەر: پزیشك ڕوونی دەکاتەوە مردنەکە چەندە پەیوەندی بە پشتگوێ خستنی چارەسەرکردنەوە هەیەو، پزیشکی چارەسەرکار لەو مردنەدا چەندە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ .

٤ - شاردنەوەی تاوانەکە: بۆ ڕێ ونکردن لە لێکۆڵەر تاوانبار هەوڵ دەدات ڕواڵەتی تاوانەکە بشارێتەوە، وەك ئەوەی کەسێك بکوژێتو، پاشتر تەرمەکەی بسوتێنێ، بە مەبەستی شاردنەوەی تاوانەکە، بەڵام پزیشکی دادیی دەری دەخات پێش سوتانەکە کوژراوە، یان ئاگرەکە هۆکاری مردنەکەی بووە.

٥ – خەملاندنی باری تەندروستی: خەملاندنی باری تەندروستی مردوو لەسەر ڕاپۆرتی پزیشکی توێکار دەوەستێت، بۆیە فەرمانگە فەرمیو نافەرمیو، کۆمپانیاکانی دڵنیایی، پێش بڕیاردان لەسەر هەر قەرەبویەك بۆ میراتگرانی مردووەکە داوای ڕاپۆرتی پزیشکی توێکار دەکەن، بۆ دڵنیابوون لەوەی ئایا هۆی مردنەکەی لە ئەنجامی ئەرکەکەی بووە بە تەنیا، یان هۆکاری دیکە بەشدار بووە لە مردنەکەدا.

٦ – زانینی کاتی ڕودانی مردنەکە: پزیشکی دادیی بە لێکۆڵینەوە لە تەرمەکەو، توێکاری کردنی بە ڕێگایەکی زانستی دەتوانێت کاتی مردنەکە دیاری بکات، بێگومان ئەمەش گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەو، ئاشکراکردنی تاوانبار.

٧ – یارمەتیدەرە بۆ زانینی جۆری ڕوداوەکە، ئایا تاوانکاری یە، خۆکوژیە، یان ڕێکەوتە، یان سروشتی یەو بە هۆی نەخۆشیەوە ڕویداوە.

٨ – زانینی هۆی مردنەکە، بەچی مردوە، ئایا بە خنکاندن، یان بە ژەهرخوارد کردن بووە، ئەمەش گرنگی زۆری بۆ دادگا هەیە بۆ دیاریکردنی جۆری ئەو سزایەی بڕیار دەدرێت.

**شەشەم: چۆنیەتی ناردنی تەرم بۆ پشکنینی پزیشکیی: (٤٢).**

ناردنی تەرمێك گومان لە مردنەکەیدا هەبێت بۆ پزیشك بە مەبەستی توێکاریکردنی، شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەش بۆ ڕێگرتنە لە هەر دەستکاریەك زیان

بە لێکۆڵینەوە بگەیەنێت، لەبەر ئەوە دەبێت لێکۆڵەر لە ناردنی تەرمدا بۆ پزیشکی دادیی پابەندی ئەم شێوازەی خوارەوە بێت:

١ – لە کاتی سەیرکردنی تەرمی مردوو لێکۆڵەر بە شوێن ئەو خاڵانەدا بگەڕێت کە بۆ ڕێکخستنی فۆرمی داواکاریی توێکاری (إستمارە گلب التشريح) پێویستیەتی، باشتر وایە پشت بە یادەوەری خۆی نەبەستێت، بەڵکو لە لاپەرەیەکدا تێبینیەکانی تۆمار بکات، لەوانە: هەر شتێکی جیاکەرەوەی شوناسی مردووەکەو، باسکردنی ڕواڵەتی پۆشاکی تەرمەکەو، بوونی هەر شتێکی نامۆ لەسەری‌و، تێبینیکردنی ئەو زیانانەی بەر تەرمەکە کەوتوون، ژمارەیان، شوێنەکەیان، جۆرەکانیان، بە مەبەستی پڕکردنەوەی خانە بۆشەکانی فۆرمەکە.

٢ – پڕکردنەوەی فۆرمی داواکاریی توێکاریی مردوو بەو زانیاریانە کە لێکۆڵەری بەرپرس پێویستیەتی، لە خوارەوەی فۆرمەکەش لێکۆڵەر پرسیاری پێویست ئاراستەی پزیشکی پشکنەر بکات‌و، واژۆی بکات‌و، بە سێ دانە (نوسخە) ڕەوانەی پزیشکی بکات، کە تەرمەکە گەشتە پزیشکی دادیی پزیشك یان نوێنەرێك لەخوارەوە واژۆی فۆرمەکە بکات‌و، بەرواری کاتی وەرگرتنەکەی بنوسێت. – پێویستە ئەو پۆلیسەی تەرمەکە وەردەگرێت وردبینی لە پڕکردنەوەو ڕاستی‌و دروستی فۆرمەکە بکات .

٣ – بە هۆی پۆلیسی هاوڕێی تەرمەکە فۆرمی داواکاریی توێکاری دەنێردرێ بۆ پزیشك، ناوی پۆلیسەکە لە فۆرمەکەدا دەنوسرێ، پزیشك یان نوێنەرەکەی پاش نوسینی ئەوەی باسکران نوسخەیەکیان وەردەگرێت‌و، دوو دانەکەی تر دەنێرێتەوە بۆ لێکۆڵەر تا ببێتە دۆکیومێنتێکی فەرمی لەسەر پێدان‌و وەرگرتنی تەرمەکە.

٤ – پەڕەی شوناس: ژمارەو بەرواری فۆرمی داواکاریی توێکاری‌و، ناوی مردووەکەو، ناوی بنکەی پۆلیسی نێرەر دەنوسرێت‌و، لێکۆڵەر واژۆی دەکات‌و، دەکرێتە مەچەکی مردووەکە. بۆ ڕێگرتن لە هەر دەستکاریەك ڕوبدات، دەبێت پزیشك پێش ئەوەی دەست بکات بە توێکاری کردن دڵنیا بێت لە ڕاستی‌و دروستی زانیاریەکان لە پەڕەی مەچەکی تەرمەکەو، فۆرمی داواکاریی توێکاریی.

## فۆرمی داواکاریی توێکاری‌و پرسیارەکانی لێکۆڵەرو دادوەر لە پزیشکی دادیی:

دەکرێت لە کاتی ناردنی تەرم، یان تاوان لێکراو بۆ پزیشکی دادیی بە مەبەستی توێکاری‌و پشکنین، ئەم پرسیارانە، یاخود هەر پرسیارێکی پێویست ئاراستەی پزیشکی دادیی بکەن، بۆ گەیشتن بە ئەنجامی راستەقینە لە بارەی تاوانەکەوە.

**ا / پرسیاری تایبەت بە پێکران‌و زامداربوون:**

١ – جۆری پێکرانەکە چی یەو، ماوەی ڕودانی چەندە؟

٢ – چ ئامێرێك بەکار هاتووە لە پێکرانەکەدا؟

٣ – ئایا پێکرانەکە بە زیندوویی بووە، یان بە مردوویی؟

٤ – پەیوەندی پێکرانەکە بە مردنەوە چی یە؟

٥ – ئایا برینەکە دروستکراوە، یان تاوانکارییە، یان خۆکوژییە، یان بە ڕێکەوتە؟

٦ – ئایا پێکرانەکە چ کاریگەرییەکی لەسەر هەست‌و هۆشی پێکراوەکە کردووە؟

٧ – ئایا پێکرانەکە پەککەوتنی لێ دەکەوێتەوە

**ب / پرسیاری تایبەت بە مردوو:**

١ – ئایا کاتی مردنەکە کەیبووە؟

٢ – ئایا هۆکاری ڕاستەقینەی مردنەکە چی بووە؟

٣ – ئایا مردنەکە تاوانکارییە، یان خۆکوژیە، یان بە ڕێکەوتە؟

٤ – ئەگەر خنکاوە، یان سوتاوە، ئایا هۆی ڕاستەقینەی مردنەکەیە، یان پێشتر مردووەو، بۆ چاوبەست کردن ئەوە کراوە؟

٥ – ئایا مردووەکە ماددەی سەرخۆشکەرو هۆشبەری بە کارهێناوە؟

**نموونەی فۆرمی داواکاریی توێکاریی**

هەرێمی کوردستانی عێراق

وەزارەتی ناوخۆ

لایەنی لێکۆڵینەوە........................................ ژمارە:

بەروار:

﴿فۆرمی داواکاریی توێکاریی﴾

بۆ/

تکایە پشکنین‌و توێکاریی بکەن بۆ تەرمی نێردراو بە یاوەریی ﴿ ﴾

بۆ دیاریکردنی هۆی مردن‌و، وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی خوارەوە:

ناو.................. ناوی باوك‌و باپیر.............................. ناوی دایك..................

رەگەز................ رەگەزنامە................. ئایین.............. تەمەن.....................

شوێنی مردن.............. بەرواری پێکران............ بەرواری مردن.........................

رەنگی پێست................ رەنگی چاو........... رەنگی موو.............. باڵا...............

﴿ناسنامەی باری شارستانی﴾

پارێزگا............. ژم. تۆمار............. ژم. لاپەرە............... ژم. ناسنامە..............

پۆشاك.....................................

جۆری ڕوداو..................................

زیانە بەرچاوەکان............................

﴿ ئەو پرسیارانەی لێکۆڵەر ئاراستەی دەزگای پزیشکی دادیی دەکات﴾

١ – ..........................................................................................

٢ – ..........................................................................................

٣ – ..........................................................................................

٤ – ..........................................................................................

ناوی وەرگری تەرم ﴿ ﴾ — بەرواروکاتی وەرگرتن ﴿ / / ٢٠١﴾ — ناوی ڕێکخەری تەرم: پلە:

ژمارەی مۆبایل:

مۆری لایەنی لێکۆڵینەوە

## لقی دوومم: توێکاریی تەرم لە دیدی شەریعەتی ئیسلام‌و یاساوە:

### دەستپێك:

کاتێك بابەتەکەمان لەسەر کاری پزیشکی‌و بە تایبەت پزیشکی دادییە، کە مامەڵە کردنە لەگەڵ جەستەی مرۆڤ‌و، بە تایبەت تەرمی مردوو، ناکرێت باس لە ڕەوایی‌و، ناڕەوایی توێکاریی تەرمی مردوو نەکەین، چونکە لە ڕوانگەی ئایینەوە -هەموو ئایینەکان- مردوو ڕێزو حورمەتی خۆی هەیەو، لە لایەن زانایانەوە مشتومڕێکی زۆری لەسەر کراوە، لەگەڵ پێویستیی توێکاری لەم سەردەمەدا زۆر کەس خۆیان لەوە دەبوێرن مردووەکەیان توێکاری بکرێت، بۆیە پێمان باش بوو ڕاو بۆچونی زانایانی ئیسلام‌و، کۆڕە فیقهیەکان بخەینە ڕوو، تا بزانرێ لە دیدی شەریعەتی ئیسلامەوە بۆ کاتی پێویست توێکاریی تەرمی مردوو ڕەوایەو قەدەغە نییە.

### یەکەم: هەڵوێستی فیقهی ئیسلامیی لە توێکاریی تەرمی مردوودا: ( ٤٣ ).

ناکرێت لە کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا باسی توێکاری تەرمی مردو بکرێت بەڵام باسی حوکمی شەرعی لە بارەوە نەکرێت، چونکە لە کۆنەوەو، تا ئێستاش مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، ئێمەیش لە خوارەوە بە کورتی‌و بە مەبەستی بەرچاو ڕوونی، ڕاو بۆچونی ئاینزا (مەزهەبە) ئیسلامیەکان‌و، کۆڕبەندو لیژنەکانی فەتوا دەخەینە ڕوو. سەرەتا نە لە قورئانی پیرۆزو، نە لە سوننەتی پێغەمبەردا -درودی خوای لەسەر- دەقێکی ڕوون‌و ئاشکرا نەهاتووە ئەوە بگەیەنێت توێکاریی تەرمی مردوو ڕەوایە یان ناڕەوایە، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ کتێبەکانی فیقهی ئیسلامی دەبینین هەندێك مامەڵە لەگەڵ تەرمی مردوودا کراوە، زانایان حوکمی شەرعیان لە بارەوە ڕونکردوەتەوە، ئێمەش دەتوانین ئەو حوکمەی پەیوەندی بە توێکارییەوە هەیە، وەك پیادەکردنی ڕێسایەکی گشتی بۆ توێکاریی تەرمی مردوو پەسەند بکەین‌و وەربگرین، گرنگترین بابەتیش لەم بارەوە باس کرابێت، پرسی هەڵدڕینی سکی مردووی سکپڕ بووە بۆ دەرهێنانی کۆرپەلەی زیندو لە سکیدا، لەگەڵ هەڵدڕینی سکی مردوو کاتێك شتێکی بە نرخی قوتدابێت. بە کورتی بۆچونی مەزهەبەکان لەم بارەوە بەم جۆرەیە:

**١ – ئاینزای (مەزهەبی) حەنەفی:**

إبن همام له ل١٠٢ی ب٢ی کتێبی **فتح القدیر**، محمد بن علي الحصکفي لة ل٢٥٨ی ب٢ی کتیبی **الدرّ المختار شرح تنویر الابصاردا** دەڵێن: ئەگەر ئافرەتێکی سکپڕ مردو، کۆرپەکەی ناو سکی دەجولا، سکی مردووەکە هەڵدەدرێتو، کۆرپەکە دەردەهێنرێت.

**٢ – ئاینزای مالیکی:**

له ل٤٢٩ی ب١ی کتێبی **الشرح الکبیر** لمختصر خلیل أبي البرکات أحمد الدردیردا دەڵێ: له مەزهەبی مالکیدا سێ بۆچون هەیە: یەکەم: ئیمامی مالیك بۆچونی وایە نابێت سکی ژنی سکپڕی مردوو بۆ دەرهێنانی کۆرپەکەی هەڵبدرێت. دووەم: سەحنون دەڵێت: ئەگەر کۆرپەکە زیندو بوو، هیوای ڕزگاربوونی هەبوو، دروسته سکی مردووەکە هەڵبدرێت. سێیەم: اللخمی دەڵێت: ئەگەر تەمەنی کۆرپەکە له مانگی حەوتەمو نۆیەمو دەیەمدا بوو دروسته سکی مردووەکە هەڵبدرێتو، کۆرپەکە دەربهێنرێ.

**٣ – ئاینزای شافیعی:**

محمد الشربینی الخطیب لة ل٣٦٧ی ب١ی کتیبی **مغني المحتاج**، و ئیمامی النووی له ل٣٠١ی ب٥ی المجموع شرح المهذب دا دەڵێن: ئەگەر مردووەکە خرابویە ناو گۆڕیشەوە، بەڵام زانرا کۆرپەکەی زیندوە، پێویسته مردووەکە دەربهێنرێتەوەو، سکی هەڵبدرێتو، کۆرپەکە دەربهێنرێت.

**٤ – ئاینزای حەنبەلی:**

مەرداوی له ل٥٥٦ ی ب٢ی کتێبی الإنصاف، و إبن قودامه له ل٣٥١ی ب٣ی کتێبی المغنی دا دەڵێن: ژنی سکپڕی مردوو ئەگەر کۆرپەکەی زیندوش بێت، بۆ دەرهێنانی کۆرپەکه سکی مردووەکه هەڵنادرێت .

**٥ – ئاینزای زاهیریەکان:**

إبن حەزم لە ل١٦٦ی ب٥ی کتێبی المحلی دا دەڵێت: ئەگەر ژنێکی سکپڕ مردو، کۆرپەکەی زیندو بوو، تەمەنی لە شەش مانگ زیاتر بوو، سکی هەڵدەدڕێت و، کۆرپەکە دەردەهێنرێ.

٦ – ئاینزای زەیدی:

محمد علی الشوكانی لە ل٣٣٦ی ب١ی کتێبی السيل الجرار المتدفق على حدائق الازهار دا دەڵێ: ئەگەر کۆرپەی سکی ژنی مردووی سکپڕ زیندو بوو، سکی هەڵدەدڕێ و، کۆرپەکە دەردەهێنرێ .

٧ – ئاینزای شیعەی ئیمامی:

محمد جواد العاملی لە ل٣٠١ی ب٤ی کتێبی **مفتاح الكرامة**، و أبو قاسمي الحلي لە ل٣ی ب١ی کتێبی **شرائع الإسلام في مسائل الحلال والحرام** دا دەڵێن: سکی ژنی مردووی سکپڕ هەڵدەدڕێت و، کۆرپەکەی دەردەهێنرێ.

**دووەم: حوکمی توێکاریی تەرمی مردوو لە فیقهی ئیسلامی هاوچەرخدا:** ( ٤٤ ).

زانا پێشینەکان بە مانای ئەمڕۆ باسی توێکاریی تەرمیان نەکردوە، بەڵام حوکمی شەرعیی هەندێك شتیان ڕونکردوەتەوە کە لەسەر تەرمی مردوو کراوە، تا ڕادەیەکی زۆر لە توێکاری ئەم سەردەمە دەچێت. زانا ئیسلامیە هاوچەرخەکانیش زۆربەیان بۆچونیان وایە لە کاتی پێویستدا دروستە توێکاریی تەرمی مردوو بکرێت، لەوانەش: شێخ عبدالمجید سلیم، شێخ محمد حسنين مخلوف، شێخ يوسف الدجوي، شێخ إبراهيم اليعقوبي، شێخ جادالحق علي جادالحق، شێخ عبدالكريم الدبان، د.أحمد شرف الدين البار، محمد البناء، محمد أبوزهرة، صبري العابدين.

سەرەڕای ئەو زانا ناودارانە، ئەم کۆڕو دەزگایانەی وڵاتە ئیسلامیە جیاوازەکانیش فەتوایان لەسەر ئەوە داوە لە کاتی پێویستدا دروستە توێکاریی تەرمی مردوو بکرێت، لەوانەش:

١ – فەتوای دار الفتوى المصرية.

٢ – فەتوای لجنة الفتوى بالازهر الشريف.

٣ – فەتوای لجنة الإفتاء بالمملكة الاردنية الهاشمية .

٤ –فەتوای وزارة الاوقاف الكويتية.

٥ – فەتوای اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء في المملكة العربية السعودية، في ١٣٩٦/٧/٢١هـ.

٦ – قرار هيئة كبار العلماء بالمملكة العربية السعودية، رقم(٤٧) بتأريخ ١٣٩٦\٨\٢٠هـ.

٧ – قرار مجلس المجمع الفقهي الإسلامي لرابطة العالم الإسلامي، المنعقد في مكة المكرمة، ربيع الآخر سنة ١٤٠٥هـ.

٨ – مشروع قرار المجمع الفقهي الإسلامي –بمكة المكرمة- الدورة العاشرة، صفر ١٤٠٨هـ.

**سێیەم: دەقی ناوەڕۆكی فەتواكان لەسەر توێكاریی تەرم: (٤٥).**

**أ - فەتوای دار الإفتاء المصرية**

**فەتوای شێخ یوسف الدجوی لە حوكمی توێكاریی مردوو لە شەریعەتی ئیسلامدا**

لە بەڕێز رەئوف پاشاوە سكرتێری كۆمەڵەی ئیسلامی هیندی لە سریلانكا پرسیارێك گەشتووەتە كارگێڕی گۆڤارەكە، پوختەكەی پرسیار كردنە لە بارەی توێكاریی مردووەوە، تیایدا هاتووە: ئایا یاسای شەریعەتی ئیسلام ڕێگا دەدات تەرمەكانمان توێكاری بكەین، یان ڕێگا نادات؟

**بەرێز مامۆستا شێخ یوسف الدجوی بەم شێوە وەڵامی دایەوە:**

لە کتێبە فقهیەکاندا دەقی یەکلا کەرەوە لەم بارەوە نییە، هەندێکیش وا گومان دەبەن حەرامەو، شەریعەت کە رێزی لە مرۆڤ گرتوەو، فەرمانی داوە ئازار نەدرێت رێگای پێنەداوە . بەڵام شارەزایان لەکاکڵەو ناوەڕۆکی شەریعەت دەزانن کە هەمیشە شەریعەت بەشوێن بەرژەوەندییەکاندا دەگەڕێتو لە هاوسەنگی کردن لە نێوان بەرژەوەندی و خراپەکاریدا هەمیشە حوکمی بە لای ئەوەدا داوە کە ژیریی و دانایی دەیخوازێت و بۆچونی دروست پەسەندی دەکات. کەواتە دەبێت دیدو بۆچونمان فراوان بێت و، لە تەك بەرژەوەندیە دروستەکاندا بڕوات کە لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا لەگەڵ گیانو ناوەڕۆکی شەریعەتدا گونجاوە کە دەستەبەرکەری بەختەوەریی دونیاو دوارۆژ دەکات. کەواتە دەڵێین:

هەرکەس سەیری توێکاری بکات – دەزانێت- لەوانەیە لە هەندێك بارودۆخدا پێویست بێت، وەك ئەو کاتەی کەسێك کەسێکی دیکە بە تاوانێك تۆمەتبار دەکات، لەوانەیە ئەنجامی توێکاری دەری بخات کەسەکە دەستدرێژی نەکراوەتە سەری و تاوانی بەرامبەر نەکراوە، ئەو کات بێتاوانیی تۆمەتبارەکە دەردەکەوێت. یان لەوانەیە دەستدرێژیی بکرێتە سەر کەسێك و، دواتر بۆ مەبەستی شاردنەوەو بزرکردنی تاوانەکە بیخاتە چاڵاوێك (بیر). سەرەڕای ئەوانەش توێکاریی ئەو زانستە پێش دەخات کە هەموو مرۆڤایەتی سودی لێدەبینێتو، زۆر کەسیش لە ئازار و تیاچوون رزگار دەکات، بۆ چەندین شتی دیکە –بە کار دێ- کە پێویست ناکات درێژەی پێبدەین. بۆیە دەبێژین: هەر کەس سەیری ئەم پوختەیە بکات ناچارە بۆ پاراستنی ئەو بەرژەوەندیە زۆر و زەوەندەو، ئەو خراپە کەمەی تیایدایە فەتوای دروستی توێکاریی بدات، ئەگەر توێکاریی مردوو بۆ ئەو مەبەستانە بێت سوکایەتی مرۆڤی تێدا نیەو پێچەوانەی رێزگرتنیشی نیە. لەکۆتاییدا دەڵێین: دەبێت زیادەڕۆیی تێدا نەکرێت، نەوەك خەڵك بە بێ گوێپێدان ئەنجامی بدات، بەڵکو دەبێت بەپێی پێویست بێت. دەبێت پزیشکان و کاربەدەستان کە سەرپەرشتی ئەو کارە دەکەن لەخوا بترسنو بزانن خوا بە توانایەو ئاگای لە هەموو شتەکانە. خوا پشتیوانی هەمووان بێت.

**ب - دەقی فەتوای ( لجنة الفتوى بالأزهر الشريف ):**

**پرسیار:** حوکمی ئیسلام بۆ توێکاریکردنی تەرمی مردوو بۆ سود لێوەرگرتنی له خوێندنی زانستی پزیشکیدا چی یە؟

**وەلام:** خوێندنی زانستی پزیشکیی بۆ بەرژەوەندی تاك و كۆمەڵگە کارێکی پێویستە، چونکە هەمووان لەو فاکتەرە لاوازیە دەپارێزێ کە لەمپەرە لەبەردەم کارو چالاکیەکانی ژیان و ئاینداریی، کار نەکردنیش پێچەوانەی فەرمانی خوایە کە دەفەرموێت: (وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورسولة)، واتە: کار بکەن چالاکیەکانتان بۆ ژیان و بۆ دوا ڕۆژ لە لای خواو لای پێغەمبەر بینراوەو، خوای گەورە پاداشتتان دەداتەوە. بۆیە خوێندنی زانستی پزیشکیی لە ( فەرزی کیفایە)یە، واتە: فێربوونی توێکاریی ئەرکی هەموانەو، ئەگەر هەندێك پێی هەڵسان ئۆباڵی لەسەر ئەوانی دیکە نامێنێت، خۆ ئەگەر کەس پێی هەڵنەسا ئەوا هەمووان تاوانبار دەبن. پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- چارەسەری نەخۆشی کردووەو فەرمانی بە تیمارکردنیش داوەو، دەفەرموێ: ( تداووا فإن الله لم يضع داءً إلا وضع له دواءً) واتە: چارەسەرکردن بەکار بێنن، خوا هەر نەخۆشیەکی ناردبێت چارەسەرێکیشی بۆ ناردووە. بێگومان زانستی پزشکیی بۆ زانینی نەخۆشیو، شوێنی دەردەکە لەلاشەداو، دۆزینەوەی چارەسەری سوودبەخش پێویستی بە فێربوونی توێکارییە. بە هەمان شێوە لە رووداوە تاوانکاریەکانیشدا بۆ زانینی جۆری تاوانەکەو سەلماندن یان نە سەلماندنی لەسەر تۆمەتبارو، بوار ڕەخساندن بۆ ئەوەی دادپەروەریی ڕێڕەوی ڕاستی خۆی بگرێت زیاتر پێویستمان بە توێکارییە، بەمەش -توێکاری کردن- دەبێتە گەورەترین ئەرك و واجب.

کۆی وتەکان ئەوەیە توێکاریکردن بۆ ئەو مەبەستانە، کارێکە زۆرجار بەستراوەتەوە بە ژیانی خەڵکەوەو، بەبێ ئەو -ژیان- نابێت، بۆیە بڕیاردان لەسەری هیچی تێدا نییە. با نەوترێت موسڵمانانی -پێشو- پشتیان بە توێکاریی نەبەستووەو ئەگەر دروست بووایە ئەنجامیان دەدا. وەڵامەکە ئەوەیە: پێشینەکان نەیانزانیوە توێکاری چی یە، بەڵکو لەو سەردەمەدا ئامرازی چارەسەر کردن دیاریکراو بووەو، بە ئەندازەی ئەزموونەکانی کۆمەڵگەکەیان بووە، پاشان بە تێپەڕبوونی کات زانستیش پێش دەکەوێتو، بەردەوام

ئاسۆی توێژینەوە نوێکان فراوانتر دەبن‌و، بە تێپەڕبوونی ڕۆژ نهێنییەکان کە پێشتر نەزانرابوون دەردەکەون. ئاینیش هانمان دەدات لە هەموو جۆرە زانستە سودبەخشەکاندا ڕۆبچین‌و قوڵ ببینەوە، ئەگەر گەشتینە –زانستێکی- نوێی وەك فێربوونی توێکاریی ئەوە وەڵامگۆی بانگهێشتکردنی ئایینە بۆ زانست. خوای باڵادەست زاناترە.

**ج - دەقی فەتوای وەزارەتی ئەوقافی کوەیتی لە مەڕ توێکاریی تەرمی مردوو**

**ژمارە ( ١/ ٨٤/٢٢٣ )**

**پرسیار:** توێکاریی تەرمی مردوو سەرەڕای ئەوەی تەرمەکە زۆر تێکدەدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە زۆر گرنگ‌و بەسود بێت، چونکە دەکرێت کۆمەڵێك زانیاری دەربخات بتوانرێت بۆ ڕزگارکردنی ژیانی کەسانی دیکە سودیان لێ وەربگیرێت، ئایا دەبێت هەڵوێستمان بەرامبەر توێکاریی تەرم چۆن بێت؟ ئەگەر بۆ خوێندکاراتی کۆلیژە پزیشکیەکان بێت، یان بۆ مردوویەك تا هۆی مردنەکەی بزانرێت.

**وەڵام:** لیژنەکە بەم شێوە وەڵامی دایەوە: نابێت بۆ مەبەستی فێرکردنی خوێندکارانی پزیشکیی توێکاری تەرمی مردووی موسڵمان بکرێت، مەگەر تەرمی مردووی ناموسڵمان دەست نەکەوێت، لیژنەکە وا دەبینێت دەبێت بە گوێرەی پێویست پارێزگاری لە ڕێزی مردووەکە بکرێت‌و، هیچ سوکایەتی پێنەکرێت‌و، توێکاریەکە بە پێی پێویست بێت. خوا زاناترە.

**د - دەقی بڕیاری دەستەی گەورە زانایان لە شانشینی عەرەبی سعودی**

بڕیاری ژمارە (٤٧) لە بەرواری ١٣٩٦/٨/٢٠ك، خولی نۆیەمی گرێدراو لە شاری تائف لە مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٩٥ی کۆچی، سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان‌و درووود بۆ محمد پێغەمبەر، لە پاشاندا: لە خولی نۆیەمی ئەنجومەنی دەستەی گەورە زانایان کە لە مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٩٦ی کۆچی لە شاری تائف گرێدراوە، چاوی خشاند بە نوسراوی ژمارە (٢/٣٢٣٢/خ)ی پایەدار وەزیری داد کە لەسەر داوای بریکاری وەزارەتی دەرەوە بە نوسراوی ژمارە (٣٤/١/٢/١٣٤٤٦) لە بەرواری ( ١٣٩٥/٨/٦ك)، هاوپێچی وێنەیەکی

یاداشتێکی باڵوێزخانەی مالیزیایە لە جددە، داوای ڕونکردنەوەی بۆچونی شانشینی عەرەبی سعودی دەكات لە بارەی پرۆسەی توێكاریی پزیشكیی بۆ مردوو بە مەبەستی خزمەتكردنی برژەوەندی پزیشكیی.

لیژنەكە ئەو توێژینەوەیەی خستە بەر باس كە لیژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستیو فەتوادان پێشكەشی كردبوو. دەركەوت بابەتەكە دەكرێت بە سێ بەشەوە:

**یەكەم:** توێكاریی بۆ مەبەستی لێكۆڵینەوە لە داوایەكی تاوانكاریدا.

**دووەم:** توێكاریی بۆ مەبەستی لێكۆڵینەوە لە نەخۆشییەكی گواستراوە، تا لەبەر ڕۆشناییەكەیدا كاری خۆپاراستن بگیرێتە بەر.

**سێیەم:** توێكاریی بۆ مەبەستی فێربوونو فێركردنی زانستیی.

پاش تاوتوێ كردنو لێكۆڵینەوە لە توێژینەوە پێشكەش كراوەكەی لیژنەی ناوبراو لەسەرەوە، ئەنجومەن ئەم بڕیارەی دا. بۆ بەشی یەكەمو دووەم ڕێ پێدان بە ئەنجامدانی – توێكاریی-بەرژەوەندی زۆریان تێدایە لە بوارەكانی ئاسایشو دادپەروەرییو پاراستنی كۆمەڵگە لە پەتا گواستراوەكان بە شێوەیەك، خراپەی بێڕێزی كردن بە تەرمەكە لە توێكاریدا زۆر كەمترە لەو بەرژەوەندییەی بەدەست دێت. بۆیە ئەنجومەن بە كۆی دەنگ بڕیاری دا، توێكاریی بۆ ئەو دوو مەبەستە دروستە، ئەگەر تەرمەكە هەركەس بێت.

بەڵام بۆ بەشی سێیەم كە توێكاریی كردنەكە بە مەبەستی فێركردنە، بە سەرنجدان لە شەریعەتی ئیسلام دەبینین بۆ دەستخستنو زۆركردنی بەرژەوەندیو لابردنو كەمكردنی خراپە هاتووە، بۆ ڕونەدانی زیانێكی گەورە زیانێكی بچوك هەڵدەبژێرێ. یاخود ئەگەر دوو بەرژەوەندی پێچەوانەی یەكتر بوون، پارسەنگی كامیان قورسە ئەوە هەڵدەبژێرێ. لەبەر ئەوەی توێكاریی ئاژەڵ جێی توێكاریی مرۆڤ ناگرێتەوەو، لە پێشكەوتنە زانستیەكانی بوارە جۆربەجۆرەكانی پزیشكیدا توێكاریی تەرم سودی زۆری هەیە، لەبەر ئەوە ئەنجومەن وا دەبینێ بە شێوەیەكی گشتی توێكاریی دروستە، بە تێبینی كردنی ئەوەی شەریعەتی ئیسلام چۆن بە زیندوویی ڕێزی بۆ مرۆڤ داناوە بە هەمان شێوە بۆ مردوویش دایناوە، احمدو

أبوداودو إبن ماجه دەگێڕنەوە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر- فەرموویەتی: ﴿ **كسر عظم الميت ككسره حياً** ﴾. واتە: شکاندنی ئێسکی مردو وەك شکاندنیەتی بە زیندوویی. بە تێبینی کردنی ئەوەش توێکاریی تەرم سوکایەتی تێدایە بۆ مرۆڤ، لەبەر ئەوەی پێویستیەکی بە پەلە نییە، بۆیە ئەنجومەن وا دەبینێت تەرمی موسڵمان بەکار نەهێنرێ -بۆ توێکاریی- بەڵکو تەرمی کەسانی دیکە پەیدا بکرێت بۆ توێکاریی. خوا پشتیوانە.

## ٥ - فەتوای لیژنەی فەتوادانی شانشینی ئوردونی هاشمی

## لەمەڕ توێکاریی تەرم و گواستنەوەی ئەندامەکانی لاشە

**پرسیار:** رای ئایین چی یە لە بارەی توێکاریی مردوو گواستنەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی زیندوو یان مردوو بۆ کەسێکی زیندوو، گواستنەوەی خوێن لە مرۆڤێکی زیندووەوە بۆ یەکێکی دیکە بۆ پاراستنی ژیان و سەلامەتی ئەندامەکانی ؟

**وەڵام:** ئەم باسە لە ڕووداوە تازە پەیدا بووەکانەو، لەسەردەمی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- و دوای ئەویش نەزانراوە، بۆیە حوکمێکی تایبەتیان لە بارەوە نییە، دەقێکی قورئانی یان فەرموودە نییە بە مۆڵەت پێدانی یاخود قەدەغە کردنی، بەڵکو حوکمی ئەمە لە کۆی ڕێساکان و بەڵگە شەرعیەکانەوە وەردەگیرێت. لیژنەی فەتوا لە شانشینی ئوردنی هاشمی وایدەبینێ، توێکاریی و گواستنەوەی ئەندامێکی لەش و گواستنەوەی خوێن بەو شێوەی لە پرسیارەکەدا هاتووە لە ڕوی شەرعەوە دروستە بە پێی ئەم بەڵگانە:

**یەکەم:** زاناکان پاراستنی پێنج پێویستیەکان بە واجب دادەنێن، لەوانەش پاراستنی گیانە، ئەوەش بە ڕزگارکردنی ژیانی موسڵمانێك دەبێت بە پاراستن و سەلامەتی ئەندامێك لە ئەندامەکانی، بە گواستنەوەی لە زیندوو یان لە مردووەوە.

**دووەم:** ڕێسا گشتییەکانی شەریعەت دەڵێن: " پێویستیی حەرام حەڵاڵ دەکات"، "پێویستیی بە ئەندازەی خۆی دەبێت" ، "پێویستیی حوکمی خۆی هەیە" ، "ئەگەر کارێك هاتەوەیەك فراوان دەبێت" ، "ناڕەحەتی و سەختی پێویست بە ئاسانکردن دەکات"، "ئەنجامدانی سوکترینی دوو زیان ئینکاری ناکرێت".

**سێیەم:** نوسینەکانی زانا پێشینەو هاوچەرخەکان دەکرێنە بەڵگە بۆ مۆڵەتدانی توێکاریی مردوو بۆ دۆزینەوەی تاوانی کوشتن، یان بۆ زانینی هۆکاری نەخۆشیەك تا پزیشکان ڕێی چارەسەرکردنی بدۆزنەوە، چەندین نموونەی تر بەرژەوەندی گشتیو تاکی تێدایە.

زانایانی حەنەفیو مالیکیو شافیعیو حەنبەلی ڕێیان داوە ژنێکی مردووی سکپڕ بۆ دەرهێنانی کۆرپە زیندوەکەی ناو سکی توێکاریی بکرێت، یاخود مردوویەك شتێکی بە نرخی قوتدابێت، دروستە بۆ دەرهێنانی شتەکە سکی هەڵبدرێت. ئەگەر زانایان لە پێناوی دەرهێنانی بڕێك پارە کە چارەکە دیناری -زێڕ- یاخود سێ درهەمی -زیو- مۆڵەتی توێکارییان دابێت، لێرەدا لە پێناو پاراستنی گیانێکو ڕزگارکردنی ژیانی کەسێك‌و، پاراستنی ئەندامێکی لاشەو دۆزینەوەی تاوانێك مۆڵەتدان شیاوترە.

نەوترێت بەڵگەی دیکە هەیە پێچەوانەی ڕێپێدانی توێکاریی تەرمی مردوو، یان گواستنەوەی ئەندامێکیەتی بۆ زیندوو، بە بەڵگەی ئەوەی شەریعەتی ئیسلام ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ **ولقد كرّمنا بنى آدم وحملناهم في البرّ والبحر وَرَزَقناهم منَ الطَّيبات وفضلناهم على كثيرٍ ممَن خَلقنا تفضيلاً**﴾. سوره الاسرا/ ٧٠ . فەرموودەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ابوداود لەسەر مەرجی موسلیم‌و، نەسائی بە سەنەدێکی دروست لە عائشەوە دایکی باوەڕداران دەگێڕنەوە: ﴿ **كسر عظم الميت ككسر عظم الحيّ**﴾. بەڵام ئەوەی ئێمە باسی دەکەین مەبەست لێی سوکایەتی پێکردن نییە، بەڵکو مەبەست لێی ڕزگار کردنی ژیانی مرۆڤو پارێزگاری ئەندامەکانیەتی، ئەم مەبەستەش مانای ڕێزگرتنی مرۆڤ دەگەیەنێ، نەك سوکایەتی پێکردنی. بەم تێگەشتنە وردەوە زانایانی پێشوو ڕێگایان داوە بۆ دەرهێنانی پارەیەك مردوویەك قوتی دابێت، یاخود بۆ دەرهێنانی کۆرپەیەکی زیندوو لە سکی ژنێکی مردوو توێکاریی بکرێت. لێرەدا لیژنەی فەتوا هۆشداری ئەوە دەدات گواستنەوەی ئەندامێك یان توێکاریکردنی دەبێت پابەندی ئەم مەرجانە بێت:

١ – بەخشەر لە ژیانی خۆیدا بە نوسراو ڕەزامەندی دەربڕێت، دوای مردنیش ڕەزامەندی باوك یان دایك، یان سەرپەرشتیارەکەی. خۆ ئەگەر تەرمەکە نەناسراو بوو، ڕەزامەندی دەستەڵاتی تایبەتمەندی لەسەر بێت.

٢ – دەبێت وەرگر ناچاری وەرگرتنی ئەو ئەندامە بێتو، ژیانی یان سەلامەتی ئەندامێکی لەسەر ئەوە وەستابێتو، ئەوەش بە ڕاپۆرتێکی پزیشکیی متمانە پێکراو لە ئایینو زانستو شارەزایی ڕوون کرابێتەوە.

٣ – ئەگەر بەخشەری ئەندام یان خوێن زیندوو بوو، مەرجە ئەو ئەندامەی دەیبەخشێ ئەندامێکی بنەڕەتی ژیان نەبێت، بە جۆرێك بێ نەبێتە هۆی مردنی بەخشەر ئەگەرچی خۆیشی ڕازی بێت.

٤ – گواستنەوەکە نەبێتە هۆی شێواندنی ڕواڵەتی بەخشەر.

٥ – نابێت بەخشینەکە بە پارە یان بۆ قازانج بێت.

لیژنەکە وریایی ئەوە دەدات زیادەڕۆیی نەکرێت لە توێکارییو گواستنەوەی ئەندام، بەڵکو تەنیا بە پێی پێویست بێت، چونکە هەر ئەوەش هۆکاری بڕیاردانی حوکمەکەیە. لیژنەی فەتوادان.

## و - پرۆژەی بڕیاری کۆڕبەندی فیقهی ئیسلامی لە مەڕ توێکاریی مردوو

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیانو سڵاو لەسەر پێغەمبەرمان محمد.

پرۆژەی بڕیاری کۆڕبەند: لە مەڕ توێکاریی مردوو (خولی دەیەم) صفری ١٤٠٨ك.

دانیشتنی گرێدراوی خولی نۆیەمی کۆڕبەندی فیقهی ئیسلامی لە بارەگای رابیتەی جیهانی ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز لە نێوان ڕۆژانی شەممە ١٤٠٦/٧/١٢ك بەرانبەر ١٩٨٦/٣/٢٢ز تا ڕۆژی شەممە ١٤٠٦/٧/١٩ك بەرانبەر ١٩٨٦/٣/٢٧ز. سەرلە بەیانی ڕۆژی پێنجشەممە ١٤٠٦/٧/١٧ك بەرانبەر ١٩٨٦/٣/٢٧ز کۆبوونەوەی خۆی لە بارەی بابەتی توێکاریی مردوو گرێدا، پاش گوێگرتن لەو دوو توێژینەوەی هەردوو

بەرێزان شێخ محمد الخطیب بن الخوجة و ، پزیشکی پرۆفیسۆر محمد علی البار بۆ ئەم مەبەستە ئامادەیان کردبوو، ئەندامان لەم بارەیەوە رایان گۆڕیەوەو، لە هەمان کاتدا پێداچوونەوەیان بە بڕیاری بەشێك لەو بابەتەدا کرد کە ئەنجومەنی دەستەی گەورە زانایان لە مانگی شەعبانی ١٣٩٦ك لە شاری تایف گرێیان دابوو،

ئەندامانی ئەنجومەنی کۆڕبەند بۆیان دەرکەوت توێکاریی مردوو بۆ یەکێك لەم سێ مەبەستە بەکار دێت:

**یەکەم:** بۆ مەبەستی دڵنیابوون‌و ساخکردنەوە لە داوایەکی تاوانکاریدا، لەم بارەدا پزیشکی شەرعیی لەسەر داوای دادگا بۆ دیاریکردنی هۆکارەکانی مردن لە حاڵەتی ژەهراویکردن‌و تاوانی کوشتن‌و ئەو جۆرانە توێکاریی دەکات.

**دووەم:** بۆ دڵنیابوون‌و ساخکردنەوەی نەخۆشی‌و پەتا گواستراوەکان، تا لە بەر ڕۆشنایی توێکاری‌و پشکنینی تاقیگەییدا پێویستیە دەستەبەر کراوەکانی خۆپاراستن لەو نەخۆشیانە بگیرێتە بەر.

**سێیەم:** بۆ مەبەستی زانستی فێربوون‌و فێرکردن، وەك ئەوەی لە ژووری توێکاریی کۆلیژی پزیشکی دەکرێت.

لەسەر شێوازی یەکەم لە توێکاریی بەرژەوەندی زۆر لە بوارەکانی ئاسایش‌و دادپارێزیدا دێتە دی، ئەوەش لە ڕێی ئەو بەڵگە زانستیانەی توێکاریی دەیخاتە بەردەست دادوەر لە کاتێکدا گەشتن بەو ڕاستیانە ئاڵۆزەو، لە ڕێی توێکاریەوە تۆمەت لەسەر بێتاوان لادەبرێت‌و، تاوانەکەش لەسەر تاوانکار دەسەلێنرێ. لە شێوازی دووەمیشدا پاراستنی کۆمەڵگەیە لە نەخۆشیە درمو گواستراوەکان. لە شێوازی سێیەمیشدا ڕێگادانە بە مامۆستایان‌و خوێندکارانی کۆلیژە پزیشکیەکان، بۆ ئەوەش دروستکردنی ئامرازی فێرکردن هەرگیز جێی توێکاریی مرۆڤ ناگرنەوە بۆیە.

## کۆڕبەند بڕیاریدا:

١ – توێکاریی تەرمی مردوو ڕێپێدراوەو، بە پێویستیەك دادەنرێت و، لە زۆر کاتدا ناتوانین دەست بەرداری ببین، ئەو خراپیەی تێیدایە لە سوکایەتیکردن بە تەرمی توێکاریکراوەکە لە بەرانبەر ئەو بەرژەوەندیە زۆرو گشتیەی لە توێکاریدا بەدەست دێ زۆر بچوکە. دەزانین ڕێسا شەرعیەکان لە پێناو بەرژەوەندیەکی گەورەدا زیانێکی بچوك پەسەند دەکەن، ئەگەر خاوەن شەرعی کاربەجێ فێربونی پزیشکیی کردبێت بە ئەرکی بەشێك لەم نەتەوەو، بە بێ توێکاریش کاری پزیشکی بەڕێوە نەچێت، کەواتە -توێکاریی- پێویستیەکەو، بۆ پزیشکان و خوێندکاران ڕەوایە مومارەسەی توێکاریی تەرمی مردوو بکەن.

٢ – ئەگەر هەبوو تەرمی ناموسڵمان توێکاریی بکرێت، خۆ ئەگەر نەبوو ئەوکات تەرمی موسڵمان توێکاریی بکرێت، چ ئەوانەی نەناسراون و، چ ئەوانەش لە ژیاندا ڕێگایان داوە دوای مردن لاشەکەیان توێکاریی بکرێت.

٣ – توێکاریکردن دەبێت بە گوێرەی پێویست بێت و، نابێت بێهودەیی لەگەڵ تەرمی مردوودا بکرێت. ئەوانەش توێکاریەکە دەکەن دەبێت ڕێز لە مردووەکە بگرن و، دوای تەواوبوونی ئەرکەکەیان، مردووەکە یان ئەو پارچانەی لە مردووەکە ماونەتەوە بنێژن.

٤ – توێکاریی تەرمی ژن پزیشکی ژن بیکات، مەگەر پزیشکی ژن نەبێت، ئەوکات پزیشکی پیاو توێکاریەکە بکات.

لەو شێوازانەی لەسەرەوە باس کران کۆڕبەند ڕێ بە توێکاریی دەدات و، ئەم ڕاسپاردانەش دەکات:

**یەکەم:** لە کۆلیژە پزیشکیەکاندا ئادابی پیشەی پزیشکیی لەسەر -ڕێنمایی- قورئان و فەرمووده دابڕێژرێ، تا دوای تەواوکردنی خوێندن پزیشك لەگەڵ زانستە پزیشکیە هاوچەرخەکاندا شارەزا بێت بە باوەڕو تێگەیشتنی دروست لە بارەی حەڵاڵ و حەرامەوە.

**دووەم:** هەوڵ بدرێت لە قۆناغەکانی خوێندندا کچ و کوڕ جیا بکرێنەوە.

**سێیەم:** لە هەموو بوارەکانی توێکاریدا ژنان پێبگەیەنرێن، تا بتوانن توێکاریی تەرمی مردوو بکەن.

**چوارەم:** کۆلیژی تایبەت بە نەخۆشیەکانی ژنان و منداڵبوون بکرێتەوە، تا ژمارەی پێویست لە پزیشکی ژنی پسپۆڕ لە نەخۆشیەکانی ژنان و منداڵبووندا پێبگەن و، ژنان ناچار نەبن خۆیان بۆ پیاوان دەربخەن.

**پێنجەم:** تیمارکردنی پیاوی نەخۆش برینپێچی پیاو بیکات و، تیمارکردنی ژنی نەخۆش پەرستاری ژن بیکات. ئەوەش لە ڕێی کردنەوەی ئامادەیی و، کۆلیژی پەرستاری و، کۆلیژی زانستە تەندروستیەکان بۆ پێگەیاندنی تەندروستکاری ژن، بۆ ئەوەی هاوشانی تەندروستکارانی پیاو کار بکەن. خوای گەورە پشتیوانی هەمووان بێت و، درود لەسەر پێغەمبەر بێت.

### لقی سێیەم: توێکاریی تەرم لە دیدی یاساوە :

یاسا ڕێگای داوە توێکاریی تەرمی مردوو بە مەبەستی فێرکاری و، زانینی نەخۆشیی و، چارەسەرکردن ئەنجام بدرێت. کاتێك پزیشك ڕاهێنانی کاری پزیشکی نوێ دەکات ئەگەر کارەکەی مەشروع و ڕەوا بوو لێپرسینەوەی لێ ناکرێت. ئەو پزیشکەی توێکاریی تەرمی مردوویەك دەکات بۆ زانینی هۆی مردنەکەو، بۆ دۆزینەوەی چارەسەر، یان بە مەبەستی فێربوون و فێرکردن، یان بۆ ئاشکرا کردنی کارێکی تاوانکاریی، ئەوە مافی خۆی پیادە کردوەو، یاسا ڕێی پێداوە. (٤٦).

زۆربەی وڵاتەکان بۆ ئەو مەبەستانەی سەرەوە ڕێگایان داوە توێکاریی تەرمی مردوو بکرێت. لە یاساکانی عێراقیشدا بەم جۆرە باسی دەکات:

**یەکەم:** لە مادەی "٣٧٤"ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە "١١١"ی ساڵی ١٩٦٩دا دەڵێ: ﴿هەرکەس بە ئەنقەست ڕێزو حورمەتی تەرمی مردوویەك یان پارچەیەك لە تەرمەکەی شکاند، یان کەفەنی بەر مردووەکەی لابرد بەند دەکرێت بۆ ماوەیەك لە دوو

ساڵ زیاتر نەبێت. خۆ ئەگەر ئەو کارە بۆ تۆڵە سەندنەوە بوو، یان بۆ سوکایەتی پێکردن بوو ئەوە بەند دەکرێت بۆ ماوەیەك لە سێ ساڵ زیاتر نەبێت﴾.

**دووەم:** لە یاسای پزیشکی دادیی ژمارە "٣٧" ساڵی ٢٠١٣ کە لە بەرواری ٢٠١٣/١٠/٢٨ لە وەقائعی عێراقی ژمارە (٤٢٩٥)دا بڵاو کراوەتەوە، هاتووە: لە مادەی (٥)، یەکەم: بڕگەی (ب)دا دەڵێ: پزیشکی دادیی بۆ دۆزینەوەی هۆی مردن توێکاریی تەرمو، پارچەی مردوو دەکات. لە بڕگە (ج)ی هەمان ماددەدا دەڵێت: پزیشکی دادیی ئامادەی پرۆسەی هەڵدانەوەی گۆڕ دەبێت بۆ دەرهێنانی تەرمەکەو، ناساندنی، یان توێکاریکردنی بۆ دۆزینەوەی هۆی مردنەکەی. یان بۆ هەر کارێکی پێویست کە دادوەری لێکۆڵینەوە داوای دەکات.

**سێیەم:** لە یاسای نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکانی مرۆڤ ژمارە (٨٥)ی ساڵی ١٩٨٦ کە لە ژمارە ٣١١٥ی وەقائعی عێراقی لە بەرواری ١٩٨٦/٩/١٥دا بڵاو کراوەتەوە، بەم شێوە ڕێ بە توێکاریی دەدات:

ماددەی یەکەم: نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکان بۆ نەخۆش لەبەر بەرژەوەندی چارەسەر دروستە...

ماددەی دووەم: ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤ لەم ڕێگایانەوە دەست دەکەون:

أ – کەسێك خۆی ئەندامەکەی ببەخشێت، یان لە ژیاندا بە نوسین ڕاسپاردە بکات دوای مردنی ئەندامەکانی لەشی ببەخشرێ، بە مەرجێك لە کاتی ڕاسپاردە کردنەکەدا شیاویی یاسایی هەبێت.

ب – ئەوانەی مێشکیان مردووە، بە ڕەزامەندی کەسێکی پلە یەکەم، یان پلە دووەمی‌و، لیژنەیەکی پزیشکی لە سێ پزیشکی پسپۆڕ پێکهاتبن، بەمەرجێك پزیشکێکیان پسپۆری مێشك‌و دەمار بێت.

**چوارەم:** له یاسای بانکی چاو ژماره (١١)ی ساڵی ١٩٩٧ که له ژماره ٣٦٧٧ی وەقائعی عێراقی لەبەرواری ١٩٩٧/٧/٧ بڵاو کراوەتەوە، دەڵێت: ئەم بانکانه لەم ڕێگانەی خوارەوە چاوی ساغ و تەندروستیان دەست دەکەوێت:

چاوی ئەوانەی کە چاویان دەبەخشن.

چاوی ئەوانەی ڕاسپاردە دەکەن دوای مردن چاویان ببەخشرێ.

چاوی ئەو مردووانەی له لایەن ئەمینداریتی پایتەختەوە دەنێژرێن.

چاوی ئەوانەی حوکمی له سێدارەدانیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

له یاسای پزیشکی دادیدا توێکاریی تەرمی مردووی لەکاتی پێویستدا کردوه به ئەرك بەسەر پزیشکی دادیەوەو، له یاساکانی نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکانی مرۆڤ و، بانکی چاودا ڕێگای داوه به توێکاریی تەرمی مردوو بۆ دەرهێنانی ئەو ئەندامانەی بەکار دەهێنرێن. بەم شێوەیە دەردەکەوێت شەریعەتی ئیسلامو، یاساکانی عێراقیش له کاتی پێویستو، بۆ بەرژەوەندی گشتی ڕێگایان داوه توێکاریی تەرمی مردوو بکرێت. (٤٧).

## سەرچاوەكان:

١ – د. وصفي محمد علي؛ الوجيز في الطب العدلي، ص٤٦. د. منصور عمر المعايطة؛ الطب الشرعي في خدمة الأمن والقضاء، ص١٤١.

٢ – د. وصفي محمد علي؛ ص٤٦، د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٣٦١، د. منصور عمر المعايطة، ص١٤٣، د. كاظم المقدادي؛ الطب العدلي والتحري الجنائي، ص١٠٣.

٣ – د. وصفي محمد علي؛ ص٤٧_٥٨. د.منير رياض حنا؛ ص٣٦١_٣٨٢.

٤ – د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٣٧٠.

٥ - د. وصفي محمد علي؛ الوجيز في الطب العدلي، ص٦٥.

٦ – د. وصفي محمد علي؛ ص٧٤_٨٤. د.منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٣٦٢_٤٠٩.

٧ – د. وصفي محمد علي؛ ص٥٨_٦٤. د. منير رياض حنا؛ ص٣٧٥_٣٧٦.

٨ – د. كاظم المقدادي؛ ص١٢٢.

٩ – د. وصفي محمد علي؛ الوجيز في الطب العدلي، ص٩٠_٩٢. د. منير رياض حنا؛ ص٤١٧_٤٢٥.

١٠ – د. وصفي محمد علي، ص٩٦.

١١ – د..هشام عبدالحميد فرج؛ الإختناق، المركز القومي للإصدارات القانونية، القاهرة، الطبعة الأولى، سنة٢٠٠٥م، ص١٩.

١٢ – د. هشام عبدالحميد فرج ص٩٦ ١١٣. د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٣١٦_٣٣٤. د. وصفي محمد علي؛ ص٩٦.

١٣ – د. وصفي محمد علي؛ ص١٣٨.

١٤ – د. منير رياض حنا؛ ص٧٤٧.

١٥ – د. منير رياض حنا؛ ص٧٥٧. د. منصور عمر المعايطة؛ ص٢٥١_٢٥٢.

١٦ – د. منير رياض حنا؛ ص٧٥٨_٧٦٥.

١٧ – د. كاظم المقدادي؛ ص١٢١.

١٨ – د. وصفي محمد علي؛ ص١١٤.

١٩ – د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٦٤٤ ٦٦٦، د.وصفي محمد علي؛ الوجيز في الطب العدلي، ص١١٨_١٢٨. د . حسين علي شحرور؛ الطب الشرعي مبادئ و حقائق، ص٢٥٦.

٢٠– د. منير رياض حنا؛ ص٥٧٩_٥٨١.

٢١ – د. منير رياض حنا؛ ص٥٨١ ٥٨٢.

٢٢ – د. السيد ابو الخير؛ نصوص المواثيق والاعلانات والاتفاقيات لحقوق الانسان، إيتراك للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الأولى، سنة ٢٠٠٥م، ص٦٧.

٢٣ – د. السيد ابو الخير؛ ص٢٦.

٢٤– د. منير رياض حنا؛ ص٥٨٤_٥٨٦.

٢٥ – د. منير رياض حنا؛ ص٥٨٧_٦٠٢.

٢٦ – د. وصفى محمد على؛ ص١٧٢.

٢٧ – د. علاءالدين مرسي؛ الأدلة الجنائية فى الطب الشرعي المعاصر، المركز القومي للاصدارات القانونية، القاهرة، الطبعة الاولى، سنة ٢٠١٤، ص٢٩_٣٣. د. وصفى محمد على؛ ص١٧٠_١٧٤.

٢٨ – انظر د. وصفي محمد علي؛ ص١٧٤_١٧٧. د.منير رياض حنا؛ ص٦٨٣_٧٠٥.

٢٩ – د. وصفي محمد علي؛ ص١٧٧_١٧٩. د. علاءالدين مرسى؛ ص٢٧_٢٩. د. منير رياض حنا؛ ص٦٧٢_٦٧٨.

٣٠ – د. وصفى محمد على؛ ص١٧٩_١٨١. د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص١٧٢_١٧٧.

٣١ – د. وصفى محمد على؛ ص٢٠_٢٢.

٣٢ – نصر شومان؛ التكنولوجيا الجرمية الحديثة واهميتها في الاثبات الجنائي، بدون ناشر، الطبعة الاولى، سنة ٢٠١١، ص٢٧٠.

٣٣ – اعداد القاضي سردار عزيز خۆشناو؛ التشريعات العقابية في القوانين العراقية، الجزء الأول، مطبعة منارة، اربيل، أقليم كردستان، سنة ٢٠١٠، ص٥٤ ٧٧.

٣٤ – د. منصور عمر المعايطة؛ ص٢٥٢.

٣٥ – د. حسين علي شحرور؛ الطب الشرعي مبادئ و حقائق؛ الناشر خاص، طبعة أولى، سنة ٢٠٠٠، ص٢٧٦.

٣٦– د. حسين علي شحرور؛ ص٧٤٧_٨١٥. د.وصفي محمد علي؛ ص١٣٨_١٥٦. ١ – د.كاظم المقدادي، الطب العدلي والتحري الجنائي، الأكاديمية العربية في الدنمارك، ٢٠٠٨م، ص١٤٢.

٣٧ – د.وصفي محمد علي، الوجيز في الطب العدلي، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، الطبعة الرابعة، ١٩٧٦م،ص٣١.

٣٨ – د.كاظم المقدادي، الطب العدلي والتحري الجنائي، ص١٤٤.

٣٩ – د. أنور أبوبكر كريم هواني الجاف، مدى شرعية تشريح جثة الإنسان، المؤسسة الحديثة للكتاب، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٠م، ص٥١.

٤٠ – د.جمال مهدي محمود الأكشة، تشريح جثة الإنسان، دار الكتب القانونية، مصر، سنة ٢٠١١م، ص١٨_٢١.

٤١ - د. وصفي محمد علي؛ ص٢٤_٣٠. د. كاظم المقدادي، الطب العدلي والتحري الجنائي، ص١٤٩.
د.منير رياض حنا، الطب الشرعي، ص٤٤٩. د. أبوبكر كريم الجاف؛ ص٢٣٥_٢٨٨.
٤٢ – د. وصفي محمد علي؛ ص١٢_١٤
٤٣ – د. جمال مهدي محمود الأكشة؛ ص٣٩_٤٥و د. أنور أبوبكر كريم هواني الجاف؛ ص١٥٦ ١٥٨، و عبدالصبور عبدالقوي علي مصري؛ جرائم الأطباء والمسؤلية الجنائية والمدنية؛ دارالعلوم للنشر، القاهرة، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١١، ص٣٢٢. و د. رمزي رشاد عبدالرحمن الشيخ؛ المسؤلية الطبية عن عمليات نقل وزراعة الأعضاء، الناشر دار الجامعة الجديدة، مصر، طبعة اولى سنة ٢٠١٥، ص٢٨.
٤٤ – د. جمال مهدي محمود الاكشة؛ ص٦٣_٦٧، د. انورابوبكر كريم الجاف؛ ص١٧٨_١٨٠.
٤٥ – د. جمال مهدى محمود الأكشة؛ ص١٢١_١٤٣.
٤٦ – د. أنور أبوبكر كريم الجاف؛ ص٢٣٢.
٤٧– د. جابر مهنا الحسيناوي؛ المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية؛ صفحات ٢٨٢ و ٢٤١ و١١٥ .

## بەشی سێیەم: رۆڵی شارەزایی و مۆر له سەلماندندا:

ئەم بەشە پەیوەندی بە سەلماندنی دادوەریی یەوە هەیە، واتە: چەندە دەتوانرێت لە رێی شارەزاییو، مۆرەکانەوە (البصمات) بوونو نەبوونی تاوانێك بسەلمێنرێ، ئەمەش خۆی لە دوو تەوەردا دەبینێتەوە:

### تەوەری یەکەم: چەمکی شارەزایی دادوەریی:

### تەوەری دووەم: رۆڵی مۆر لە سەلماندندا:

# تەوەری یەکەم: چەمکی شارەزایی دادوەریی:

## لقی یەکەم: پێناسەی شارەزایی:

شارەزایی لە زماندا واتە: تاقیکردنەوە، لێزانین، ڕاستەقینە ناسین، بەم پێیە شارەزا دەبێت لە کارەکەیدا شارەزایی زانستیو، پراکتیکی هەبێت. لایەنی پراکتیکی لە لایەنی تیۆری گرنگترە، چونکە ئەگەر مرۆڤ شارەزایی بە پراکتیکی پیادە نەکات تەنیا لایەنی تیۆریی بزانێت سودی تەواوی لێ وەرناگرێت. فەقیهەکانو، پسپۆڕانی یاسا پێناسەی زۆری شارەزاییان کردوە. ئێمەش چەند پێناسەیەک لەوانە وەردەگرین:

١ – **شارەزایی:** ئامرازێکە لە ئامرازەکانی دەستخستنی زانیاریی پێویست لە کەسانی پسپۆڕەوە، لەو بابەتانەی لایەنە نەیارەکان کێشەیان لە سەری هەیە. (١).

٢ – **شارەزایی:** راوێژکردنێکی هونەرییە لە کارێکی دیاریکراودا، خەملاندنی پێویستی بە زانیاریو لێزانینێکی تایبەتە، کە لێکۆڵەر خۆی ئەو شارەزایەی نییە، وەک توێکاریی کوژراوێك بۆ زانینی هۆکاری مردنەکەی. (٢).

٣ – **شارەزایی:** راوبۆچوون یان راوێژکاریەکە شارەزا لە پسپۆڕیی خۆیدا پێشکەشی دادوەری لێکۆڵینەوەی دەکات، زۆرجار دۆزینەوەی تاوانەکانو، لێکۆڵینەوە تیایاندا پێویستی بە ڕایەکی زانستیی، یان هونەریی، یان پیشەیی هەیە. یاسا مافی داوە بە دادوەر لە خۆیەوە، یان لەسەر داوای نەیارەکان ئەو بڕیارە بدات. (٣).

لە بەر فراوانبونی پسپۆڕیەکانو، ئاڵۆزبونی کایەکانی ژیان، کەسێك ناتوانێت لە هەموو بوارەکاندا پسپۆڕیی پەیدا بکات، دادوەر کەسێکی پسپۆڕە لە زانستە دادوەرییو، یاسایەکانداو، لە بەر فراوانیو زۆربونی بوارەکان ناتوانێت گرنگیی بە هەموو بوارەکان بدات، بۆیە ناچارە لە هونەرە جیا جیاکاندا پەنا بۆ کەسی شارەزا ببات، بۆ ئەوەی ڕاو بۆچونی خۆیان دەربڕن، تا بڕیاری دادوەریی لە سەر بناغەیەکی ڕوون بنیات بنرێت، یەکێك لەو شارەزایانەش پزیشکیی دادییە، دەبێت دادگاو دادوەر لە کارەکانی وەك دیاریکردنی تەمەنو، ئاستی ژیریی، بۆ دیاریکردنی بەرپرسیارێتی سزایی پەنای بۆ ببات.

### لقی دووەم: گرنگیی و ڕەوایی شارەزایی لە یاسادا:

### یەکەم: گرنگیی شارەزایی:

١ کەسی شارەزا ئەو بەڵگە هونەریانە دەچەسپێنێ کە پەیوەندیی بە پرسە هونەریەکانەوە هەیەو، دادگاکان بە پێی پێکهاتەی پسپۆڕیی ئەندامەکانی ناتوانێت پەی پێ ببات‌و، ڕێی تێدا دەربکات‌و، لە بارەیانەوە بگات بە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە. بۆیە نابێت دادوەری تاوانەکان لە پرسە هونەریەکاندا خۆی بخاتە جێی شارەزا، چونکە خۆی بە تەنیا ناتوانێت بگات بە ڕاستیەکان. بە هۆی پێشکەوتنە زانستیەکانەوە لەم سەردەمەداو، لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ڕوداوانەی پەیوەندیان بە تاوان‌و تاوانبارانەوە هەیەو، ئەو ئەنجامە وردانەی لە ڕێی پسپۆڕانی ئەو زانستانەوە نەبێت ناتوانرێ دەست بخرێ، گرنگیی شارەزایی زیاتر بووە. کە لە خۆیدا هاوکاریەکی بەنرخە بۆ دادوەریی. (٤).

٢ - لە ڕوداوە گرنگەکانی داوای سزاییدا شارەزا بە شوێن ڕاستیەکاندا دەگەڕێت، واتە ئەو ڕوداوانەی پەیوەندیان بە جۆری تاوانەکەو، چەندە پەیوەندی بە تۆمەتبارەوە هەیە.

٣ - شارەزایی ئەرکێکی هونەری یە، چونکە دەبێت شارەزا پشت بە زانیاریە زانستیەکان ببەستێت.

٤ - ئەرکی شارەزا سروشتێکی دادوەریی هەیەو، لەو لایەنە هونەریەوە هاوکاری دادوەر دەکات کە دادوەر پسپۆڕیی تێدا نییە.

٥ - تاوانە هاوچەرخەکان بە شێوازێکی نوێی ناباو دەکرێن‌و، تاوانباری سەردەم بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانی سود لە تەکنەلۆژیای نوێ وەردەگرێ، بۆیە گرنگیی شارەزایی هونەریی بۆ ئاشکرا کردنی شوێنەواری تاوان‌و، کردارە تاوانکاریەکان زۆرترو پێویستتر بووە.

٦ - ئەگەر لە کاتی بەڕێوەچونی داوای تاوانکاریدا پرسێکی هونەریی بوروژێنرێ‌و، یەکلاکردنەوەی داواکەی لەسەر بوەستێت‌و، دادوەر نەتوانێت قسەی یەکلاکەرەوی تێدا

بکات، چونکه پێویستی به پسپۆرییەکی هونەری هەیەو، دادوەر لێی نازانێت، بێگومان لەو کاتەدا پێویستی به شارەزایی هەیە. وەك پشکنینی باری ژیریی تۆمەتبار بۆ خەملاندنی شیاویی بەرپرسیارێتی، یان پشکنینی تەرمی کوژراوێك بۆ دیاریکردنی هۆکاری مردنەکەی. (٥).

دووەم: رەوایی شارەزایی له یاسادا:

برگەی سێیەمی ماددەی (١٣٩)ی یاسای سەلماندنی ژمارە (١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩ دەڵێ: ﴿ئەگەر دادگا وایبینی بۆ یەکلاکردنەوەی داوایەك و، گەیشتن به بڕیارێکی دادپەروەرانه یارمەتیی شارەزا پێویسته، دەتوانێت داوای یارمەتی لێ بکات...﴾. له برگەی (أ)ی ماددەی (٦٩)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائیەی ژمارە ٢٣ی ساڵی ١٩٧١دا دەڵێ: ﴿دادوەر یان لێکۆڵەر بۆی هەیه لەخۆیەوە، یان لەسەر داوای نەیارەکان شارەزایەك یان زیاتر دابنێت بۆ ئەو تاوانەی که لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێت﴾. له ماددەی (٢)ی یاسای پزیشکی دادیی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣، دەبێژێ: ﴿ ئامانجی فەرمانگەی پزیشکی دادیی دیسپلینکردنی کاری پزیشکی دادییه له عێراقداو، گەشەپێدانی ئەرکەکانیەتی و، بەرزکردنەوەی ئاستی لێهاتوویی و کارامەیی کادیرەکانی بوارەکەیه بۆ یارمەتیدان و هاوکاریکردنی دادپەروەریی﴾. (٦). له رێنمایەکانی پزیشکی دادیی که له ژمارە (٢٢٤٠)ی وەقائعی عێراقیدا له بەرواری ١٩٧٣/٤/٢٣دا بلاو کراوەتەوە، لەماددەی (٥)دا دەبێژێ: ﴿ پاش ئەوەی پزیشکی دادیی له سەرچاوەیەکی لێکۆڵینەوە، یان دادوەریەوە داوایەکی لێ دەکرێت، دەست دەکات به پشکنین و، دەبێت پێش دەستپێکردن بزانێت رووداوەکه چۆن بووە.﴾. (٧). له ماددەی (١٤)ی هەمان رێنماییدا دەڵێ: ﴿پاش ئەوەی به نوسراو به شێوەی فۆرم -فۆرمی داواکاری توێکاریی- له سەرچاوەیەکی لێکۆڵینەوە، یان دادوەریی داوای توێکاریی دەکرێت، پزیشکەکان پرۆسەی توێکاریی تەرم دەست پێدەکەن﴾. (٨). لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە، سەرەرای گرنگیی پشت بەستن به شارەزا بۆ بەرچاو روونی دادگاکان له بڕیارداندا، ئەم دەقه یاسایانەی سەرەوە نەك هەر رەوایەتیی، بەڵکو کردویەتی به ئەرك لەسەر داوای نەیارەکان بۆ را دەربڕین دادوەریی داوای شارەزا بکات. له هەمان کاتدا کردویەتی به ئەرك به سەر پزیشکی دادییەوە هەرکات

لە لایەنێکی لێکۆڵینەوە، یان دادوەریەوە داوای لێکرا بچێت بە دەم داواکەیانەوەو، ڕاو بۆچونی خۆی دەربرێت.

### لقی سێیەم: بەهای یاسایی ڕاپۆرتی پزیشکیی:

#### ١ - پێناسەی ڕاپۆرتی پزیشکیی:

أ - ڕاپۆرتی پزیشکیی شایەتیدانێکی پزیشکیی نوسراوە، پەیوەندی بە ڕوداوێکی دادوەریەوە هەیەو، هۆکارو بارودۆخو ئەنجامەکانی چارەسەر دەکات. (٩).

کەواتە: ڕاپۆرتی پزیشکیی ڕونکردنەوە یان شایەتیدانێکی پزیشکیی یە، باسی بارو دۆخێك دەکات، وەك بەرکەوتن، یان بریندداربوون، یان نەخۆشیی، یان پەککەوتن، یان سکپڕیی، یان مردن، یان خەملاندنی تەمەن، یان دەرخستنی ئاسەواری کردارێکی دیاریکراو لە جەستەدا، یان ڕوونکردنەوەی ئاستی شیاویی تەندروستی کەسێك بۆ کارێکی دیاریکراو... یان شیکاری تاقیگەیی سەمپڵێکی دیاریکراوی وەرگیراو لە کەسێك، هەموو ئەمانە بۆ سەلماندنی بوون یان نەبوونی ئەو شتە داواکراوەیە.

#### ٢ – بەهای یاسایی ڕاپۆرتی پزیشکیی:

لە زۆربەی یاسا هاوچەرخەکانی ئەم سەردەمەدا سەلماندنی تاوانکاریی لەسەر سیستەمی بەڵگە یاسایەکان ڕاناوەستێت، واتە بە شێوەیەك بێت یاسادانەر پێشتر کۆمەڵێك مەرجی دانابێتو، لادان لێی قەدەغە بێت، بەڵکو سەلماندن لەسەر ئەوەیە، خەملاندنی بەهای بەڵگەکان مافی ڕەهای دادوەرە، یاسادانەر بە هێزیی هیچ بەڵگەیەکی بەسەری ئەوانی دیکەدا نەداوە، نیشانەی جیاکەرەوەی سیستەمی سەلماندنی تاوانکاریی "دادوەر شارەزای شارەزایانەو، دادگاش شارەزای باڵایە". یاساکان هەرچەند جیاوازن، بەڵام لەسەر ڕەهایی قەناعەتی دادوەر کۆکن. بەو پێیەی باشترینو، بەهێزترین سیستەمی پارێزەری مافی مرۆڤە. (١٠). ڕاپۆرتی شارەزا لە داوادا بە بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی سەلماندن دادەنرێ، ئەگەر دادگا دڵنیابوو لە ڕاستگۆیی‌و، لێزانینی شارەزاکە لە ئەرکە پێ سپێراوەکەیدا دەتوانێت لە بڕیارداندا وەك هۆکارێك پشتی پێ ببەستێت، خۆ ئەگەر دادوەر

قەناعەتی نەکرد ڕاپۆرتی شارەزا بە تەنیا بکا بە هۆکار لە حوکم دەرکردندا ئەگەر بە بەڵگەیەکی دیکە پشتگیریی نەکرێت، بێگومان لە تاوانە ئابڕووبەرەکاندا نابێت پشتگوێ بخرێت. شایەتی قوربانیەکەو، ڕاپۆرتی پزیشکیی دادیی دەبنە هۆکار بۆ تاوانبارکردنی تۆمەتبار، بڕیارەکانی دادگای پێداچوونەوە (محمكه التمييز) بەڵگەن لەسەر ئەوەی دادگا ڕاپۆرتی پزیشکی بە هێند وەرگرتووە، ❊ ئەمانەش چەندنموونەیەکن لە بڕیارەکانی دادگای پێداچونەوەی عێراقو هەرێمی کوردستان، لە میانەیانەوە دەردەکەوێت ڕاپۆرتی پزیشکیی ئەگەر پێچەوانەی ڕاپۆرتێکی وەك خۆی نەبێتو، بە بەڵگەیەکی تر پشتگیری کرا، ئەوا پشتی پێ دەبەسترێتو، لە داوادا بە بەڵگەی یەکلا کەرەوە دادەنرێت، بە تایبەت لە بواری تاوانی دژ بە ڕەوشتو ئادابە گشتیەکان، ئیتر بۆ تاوانبار کردن بێت، یان بۆ بێتاوانی دەرخستن. دادگای پێداچونەوەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە (٩٦٥) لە بەرواری ١٩٦٦/٣/٢٢ دەڵێ: { لە تاوانی دژە ئادابەکاندا پشت دەبەسترێ بەو ڕاپۆرتە پزیشکیەی لە پەیمانگای پزیشکیەوە دەردەچێت}. بۆیە لەوانەیە بۆ پێشکەش کردنی بەڵگەکانی دیکە شارەزایی بکرێت بە پێوەر، بە تایبەت لە چوارچێوەی تاوانە سێکسیەکاندا، دادگای پێداچونەوەی عێراق لە بڕیارێکدا دەڵێ: { لەسەر ڕێڕەوی ڕاپۆرتی پزیشکی کە ئاماژە بەوە دەکات پەردەی کچێتی قوربانی لە ماوەیەکی کۆنەوە لابراوە، لەسەر دادگایە دان پیانانی تۆمەتبار بنرخێنێ}. هەرچەندە دادگا دەستەڵاتی نرخاندنی بەڵگەکانو، ڕای شارەزایشی هەیە، بەڵام دادگا جیاوازی نێوان پرسە هونەریە ئاسایەکانو، پرسە زانستیە ڕووتەکان دەکات. لە یەکەمیاندا دەکرێت دادگا ڕاپۆرتی شارەزا پشتگوێ بخات، بەڵام لە دووەمیاندا ناکرێت دادگا بە گوێرە ڕاپۆرتی شارەزا پشتگوێ بخات. ئەگەر پێچەوانەی ڕاپۆرتێکی زانستیی وەك خۆی نەبێت. مۆری بۆماوەییش لەو بابەتە زانستیەیە کە ناکرێت دادگا کاری پێ نەکات، مەگەر پێچەوانەی ڕاپۆرتێکی پزیشکی تر بێت لە هەمان بواردا، یان ڕاپۆرتەکە لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەوە بێت یاسا ڕێی بۆ داناوە. دادگای پێداچونەوەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە (٤٥٥) لە ١٩٧٥/٦/٣ دەڵێ: { ئەگەر دوو ڕاپۆرتی پزیشکی لە دوو نەخۆشخانەوە دەرچونو، پێچەوانەی یەکتر بوون پێویستە هەردوو ڕاپۆرتەکە هەواڵەی لیژنەیەکی پزیشکی تایبەت بکرێن، بۆ دووبارە کردنەوەی پشکنینەکەو، دادگا بۆی نییە لە خۆیەوە یەکێکیان پەسەند بکاتو، ئەوی تر پشتگوێ بخات}. لە بڕیاری ژمارە:

١٠٦٥/ سزای یەکەم – تاوانەکان/ ١٩٨١، لە بەرواری ٧/٢٧ /١٩٨١، دەڵێ: { وتەی تاوان لێکراو لەگەڵ شایەتی یەك شایەتو، ڕاپۆرتی پزیشکی بە بەڵگەیەکی تەواوی سەلماندن دادەنرێت }. لە بڕیارەکانی دادگای پێداچونەوەی هەرێمی کوردستانیشدا لەم بارەوە دەڵێت:

ژمارە یەك /تاوانەکان/ ١٩٩٣، لە بەرواری ٢٥/ ١/ ١٩٩٣، { ناکرێت تەمەنی تۆمەتبار بە هەڕەمەکی بخەملێنرێ، بەڵکو دەبێت شوناسی باری کەسێتی بە پێی سەرژمێرییساڵی ١٩٥٧ هاوپێچی دۆسیەکەی بکرێت، ئەگەر نەیبوو، یان ڕواڵەتی پێچەوانەی ئەوە بوو، تۆمەتبار بنێردرێ بۆ لیژنەی پزیشکیی تا بە ئامرازەکانی تیشك و تاقیگە تەمەنی دیاری بکرێت}.

ژمارەی بڕیار ٢٤/ دەستەی سزایی/ ١٩٩٩، بەرواری بڕیار ١١/ ٢/ ١٩٩٩. { لە ڕوداوی کەیسەکەوە سەلماوە بریکاری تۆمەتبار ... بۆ مەبەستی ڕەوانەکردنی بریکارگرتەکەی بۆ لیژنەیەکی پزیشکیی داوایەکی پێشکەشی دادوەری لێکۆڵینەوەو دادگا کردووە، چونکە لە کاتی خۆیدا لە هەڵەبجە بەر بۆردومانی کیمیایی کەوتووەو، بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئێراندا لەژێر چارەسەردا بووەو، بۆردومانەکە بە شێوەیەك کاری کردوەتە سەر ڕەفتارو هەڵسوکەوتی نەتوانێت چاکەو خراپەی خۆی جیا بکاتەوە. دادگا بەدەم داواکەیەوە نەهاتووە. بۆیە بڕیاردرا بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی داواکەو، گەڕانەوەی بۆ دادگاکەی بۆ هەواڵەکردنی بۆ لیژنەیەکی پزیشکی پسپۆڕ بۆ پشکنینو، ڕونکردنەوەی ئەوە ئایا لە ڕۆژی دەست بەسەراگرتنی ئەو ماددە هۆشبەرەی لای بووە کە دەکاتە بەرواری ١٧/ ٦/ ١٩٩٨ هەستی بە بەرپرسیاریەتی کارەکەی کردووە یاخود نە؟ ئایا لەو کاتەدا هەستی بە لاوازیو کەمیی دەرك کردنو ویستو ئیرادەی کردوە یاخود نە؟ ئایا ئێستا دەتوانێت بەرگریی لە خۆی بکات یان نە؟ پاشان لەسەر ئەوە ڕێکارەکان بگرنە بەر. بڕیارەکە بە ڕێکەوتن دەرچوو.}.

بڕیاری ژمارە /١٩٦/ دەستەی سزایی/ ٢٠٠٤، بەروار ١٥/ ٨/ ٢٠٠٤. { پاش وردبینی، ڕوداوەکانی دۆزەکە ئاماژەن بە بوونی گومان لە تەندروستی توانای ژیریی

تۆمەتبار أ... بۆیە پێویستە بنێردرێ بۆ لیژنەیەکی پزیشکیی پسپۆڕ بۆ پشکنین، تا ئەوە ڕوون بکاتەوە، ئایا لە بەرواری ئەنجامدانی تاوانەکاندا دەرك و ویستی لە دەست داوە؟ ئایا لەو بەروارەدا هەستی بە بەرپرسیارێتی کارەکەی کردوە؟ لەبەر ئەوە هەموو بڕیارەکانی داواکە هەڵوەشێنرایەوەو، گەڕێنرایەوە بۆ دادگاکەی، تا لەبەر ڕۆشنایی وەڵامی لیژنە پزیشکیەکە ڕێکاری یاسایی بگیرێتە بەر. بڕیارەکە بە زۆرینە لە ١٥/ ٨/ ٢٠٠٤ دەرچوو.}.

ژمارە /٤٩ / دەستەی سزایی یەکەم/ ٢٠٠٧. بەرواری ١٧/ ٤/ ٢٠٠٧، { تۆمەتبار... لە بەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا بە ڕاشکاوی ددانی بەوەدا ناوە لەگەڵ تاوان لێکراو... سێ جار پاشبازی کردوە، بۆیە بەڵگەکان بەشی ئەوە دەکەن لە بارەی ئەوەی دراوەتە پاڵی لێپرسینەوەی لێ بکرێت، بەڵام لە ڕاپۆرتی پزیشکیەوە ئەوە دەردەکەوێت پاشبازی ڕوی نەداوە. بۆیە کرداری تۆمەتبار لەگەڵ ماددەی ٣٩٤ی سزاکان جووتە نەك ماددەی ٣٩٣ وەك دادگای نەوجوانان بۆی چووە...}. ﴾. (١١).

لێرەدا ڕوون دەبێتەوە دادگای پێداچونەوەی عێراق و هەرێمی کوردستان بێ دوو دڵی پشتی بە ڕاپۆرتی پزیشکیی بەستووە. یاسادانەری عێراقی لە یاسای أصول المحاكمات الجزائیەدا بە دەقێکی ڕوون چارەسەری بەهای یاسایی شارەزایی نەکردوە، بەڵکو وەك هەموو بەڵگە سزایەکانی تر پابەندی دەسەڵاتی دادگای بابەتە.. یاسای سەلماندنی ژمارە (١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩ز لە ماددەی (١٤)دا پرەنسیپی (ئازادیی دادوەر لە قەناعەت کردن)ی هەڵبژاردوە،وەك دەڵێ: ((یەکەم- دادگا بۆی هەیە ڕاپۆرتی شارەزا وەك هۆکارێك بۆ حوکمدان پەسەند بکات. دووەم- دادگا پابەند نابێت بە ڕاوبۆچونی شارەزاوە...)). (١٢). لە ماددەی (٢١٣)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائیەدا دەڵێ: ﴿لە داوادا دادگا لەسەر ئەو قەناعەتەی خۆی حوکم دەدات کە بەڵگە پێشکەش کراوەکان لە خولەکانی لێکۆڵینەوەو، دادگایی کردندا بۆی دروست کردووە، کە دانپیانان و، شایەتیدانی شایەت و، کۆنوسی لێکۆڵینەوەو، کۆنوس و بینینە فەرمیەکانی تر و، ڕاپۆرتی شارەزایان و هونەریەکان و، گرینەکان و بەڵگەکانی تر کە یاسا بڕیاری لەسەر داوە﴾. هەڵسەنگاندنی بەڵگەکانی هەر تۆمەتبارێك تایبەتە بە دادگای بابەتەکەوە بە تەنیاو، چۆنیش قەناعەت دەکات ئازادە. لە

ڕاستیدا پرەنسیپی ئازادیی دادوەر له قەناعەتکردندا ئەو بەرژەوەندیەی تۆمەتبار نافەوتێنێ کە گرینەی بێتاوانی بۆی دەستەبەر دەکات، چونکە ئازادیی دادوەر پابەندی ژمارەیەك ڕێسای یاساییەو، ئامانجەکانیان ئەوەیە قەناعەت کردنەکە له گەڵ حەقیقەتی واقعیدا جووت بێت. ئەوەش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گرەنتییەکە بۆ تۆمەتبارو، ڕێزدانانە بۆ گرینەی بێتاوانیی (قرينة البراءة). مەرجەکانی ئەو ڕێسایانەش ئەوەیە دەبێت قەناعەتی دادوەر بە تاوانبار کردن لەسەر سۆزو عاتیفە دانەمەزرابێت، بەڵکو لەسەر عەقڵ‌و ژیریی دامەزرابێت‌و، له پلەیەکی متمانەی وادا بێت کە گومان هەڵنەگرێت. ئەمەش وادەکات ئازادیی قەناعەتی دادوەر نەگاتە پلەی کۆنترۆڵکردن. (١٣). کەواتە ئازادیی قەناعەتی دادوەر ئازادیەکی ڕەهاو کۆنترۆڵکەر نییە، دەبێت ئەو قەناعەتەش عاتیفیانە نەبێت، بەڵکو دەبێت "قەناعەتێکی عەقڵی بێت‌و، لەسەر متمانەو یەقین دامەزرا بێت". نابێت بە پێی سۆزو ئارەزوی خۆی دادوەریی بکات‌و بڕیار بدات. بەڵکو دەبێت له بیرکردنەوەیدا بۆ گەیشتن بە قەناعەت بە شوێن لۆژیکێکی وورددا بگەڕێت. ئەگەرچی دادگای پێداچونەوە بۆی نییە له دروستکردنی قەناعەتدا چاودێریی دادوەر بکات، بەڵام بێگومان ئەگەر بیرکردنەوەکەی دادوەر پێچەوانەی لۆژیك‌و بناغەیەکی بڕیار لەسەردراوی بەڵگە هێنانەوەی دادوەریی بێت پشتگیری بڕیارەکەی ناکات. ئەگەرچی دادوەر پابەند نییە هۆکارەکانی قەناعەت کردنی کەسێتی خۆی ڕوون بکاتەوە، بەڵام پێویستە هۆکانی حوکمدانەکەی ڕوون بکاتەوەو، باسی ئەو بەڵگانە بکات کە پشتی پێبەستوون . (١٤).

# تەوەری دووەم: رۆڵی مۆر لە سەلماندندا:

## لقی یەکەم: ناسینەوە:

### یەکەم: ناسینەوە چی یە ؟

ناسینەوە لقێکە لە لقەکانی پزیشکی دادیی‌و، تایبەتە بە ناسینەوەی کەسێک‌و دیاریکردنی شوناسی کەسەکە، بەم شێوە ناسینەوەی کەسێکی نەناسراوو، تەرمی مردوو، پارچەی لەش‌و ئێسک، کاری ئەم لقەی پزیشکییە. (١٥).

### دووەم: جۆرەکانی ناسینەوە: (١٦).

جۆرەکانی ناسینەوە بە پێی مەبەستەکەی‌و، ئەو بوارانەی تێیدا بەکار دێت‌و، ئەو کەسانەی پێی هەڵدەستن دەگۆڕێت. ئەو جۆرانەش ئەمانەن:

#### أ – ناسینەوە لە رێی خودی کەسەکەوە:

ئەوەیە ناسینەوەی تەرمەکە لە میانەی ئەو بارودۆخەوە دەبێت کە تێیدا بووە، وەك ئەوەی تەرمەکە لە شوێنێکدا دۆزراوەتەوە، لە جۆگەلەیەکدا دەرهێنراوەتەوە، یان کەسێك شوێنی نێژرانەکەی بزانێت، لێکۆڵەری تاوان کۆنوسێکی بۆ دەکاتەوەو، چۆنیەتی ناسینەوەکەی تێدا دەنوسێت، پزیشکی دادیش نیشانە جیاکەرەوەکان‌و هەر شتێکی تر لە شوێنەکەیدا هەبێت تۆمار دەکات، ئەگەر نێژرابوو شێوازی ناشتنەکەی‌و، ئەو کفنەی لە بەریدایەو، ئەو ماوەی تێپەڕیوە بە سەر مردنەکەیدا، لەگەڵ هەر ئاسەوارێکی توێکاریی یاخود شتێکی دیکە لەسەر تەرمەکە. لەم شێوە ناسینەوەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت ئایا تەرمەکە لە ماڵێکدا بووە، یان لەکێڵگەیەکدا، یان لە باخچەیەك، یان سەرئاوکەوتوە، یان کراوە بەژێر گڵەوە، یان خراوەتە چاڵێك، یان لەسەر رێگایەك فڕێدراوە؟ ئایا وەك خۆی ماوەتەوە، یان شێوێنراوە؟ ئایا هیچ پارچەیەکی لێنەکراوەتەوە، ئایا بە دەما کەوتوە یان بە پشتدا، لەناو جێگادا بووە یان نا؟ ئایا چەکی بەدەستەوە بووە یان نەخێر؟ دەبێت لێکۆڵەر ئەوەش دیاری بکات لە کوێ دۆزراوەتەوە؟ چۆن دۆزراوەتەوە؟ کێ دۆزیویەتیەوە؟ کێ

ڕێنیشاندەر بووە؟ ئایا تەرمەکە جوڵێنراوە یان پاکژ کراوەتەوە؟ ئایا پۆشاکەکەی لابراوە؟ ئایا شۆردراوەو کفن کراوە؟ لە هەمان کاتدا ئەگەر کرا دیاریکردنی ڕەگەز و تەمەنی، دیاریکردنی ڕەگەزنامەو ئاین و ڕەنگی خۆی و قژی و هەر نیشانەو خاڵێك لەسەر لاشەکەیەتی.

**ب – ناسینەوەی کەسیی:**

تەرمەکە بەوە دەناسرێتەوە کە تەرمی خودی فلان کەسە، ئەوەش دەبێتە ئەرکی لێکۆڵەر، لەو کاتەدا گوێی لە وتەی شایەتەکانە کە شایەتی دەدەن ئەمە ئەو کەسەیە. خۆ ئەگەر تەرمەکە ڕزیبوو لەوانەیە لە ڕێی پێناس‌و بەڵگەی فەرمییەوە، یاخود لە ڕێی پۆشاکەوە بناسرێتەوە. دەبێت پزیشکی دادیی بەراوردی ئەو نیشانانە بکات لە تەرمەکەدا هەیە لەگەڵ ئەو نیشانانە شایەتەکان دەیڵێن.

**ج – ناسینەوەی مەدەنی:**

ئەمە کاتێك دەبێت کەسێك دەمرێت‌و، خەڵکانێك بانگەشەی میراتگریی مردووەکە دەکەن، ئەوەش لە ڕێی خزمەکان‌و شایەتەوە دەسەلێ، لێرەدا باشتر وایە پزیشکێك دیاری بکرێت بۆ بەراورد کردنی نیشانە جیاکەرەوەکانی سەر تەرمەکەو وتەی شایەت‌و خزمەکان، وتەکانیان پشت ڕاست بکاتەوە یان بە درۆ بخاتەوە.

**د –ناسینەوەی تاوانکاریی:**

ئەمەش ناسینەوەی کەسێکە تاوانێکی دیاریکراوی کردوە، هەموو کەسێك لە ڕوداوێکدا وێنەیەکی فۆتۆگرافی لە پێشەوەو لە لاوە دەگیرێت، هەروەها درێژی باڵاو باسك‌و پەنجەی ناوەڕاست‌و پێی دەپێورێت، ڕونکردنەوە لەسەر ڕەنگ‌و شێوەی گوێ‌و برۆکان‌و چاوو قژی دەدرێت، دەبێت تێبینی ئەوە بکەین بە دروستبوونی ڕیش‌و سمێڵ ڕواڵەتی مرۆڤ دەگۆڕێت‌و، بە گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبونیش زانیاری‌و ڕەوشت‌و داب‌و نەریتیش دەگۆڕێت، لەوانەیە نەخۆشیش ڕواڵەتی مرۆڤ بگۆڕێت.

## سێیەم: گەشەکردنی ناسینەوە: (١٧).

ناسینەوەی کەسایەتیەکان و، پرسی تۆمار کردنی تاکە تاوانبارەکان تا سالّی ١٨٨٢ لە وەسفکردنو گرتنی وێنەیەکی فۆتۆگرافی تێنەدەپەڕی، لە سالّی ١٨٨٢ "بیرتیلۆن" شێوازێکی نوێی داهێنا، ئەویش گۆڕینی شێوازی وەسفکردنی لاشە بوو بۆ پێوانە کردنێکی ورد بۆ هەندێك لە بەشەکانی لاشە. حکومەتی فەرەنسا ئەم شێوازەی بەکار هێناو، بەمەش ناسینەوەی هونەریی هەنگاوێکی گەورەی بەرەو پێشەوە هەلّگرت.

**ئەمەی خوارەوە شێوازەکەی بیرتیلۆن بوو:**

- باسکردنی ڕوالّەتی لاشە بە درێژیی، وەك ڕەنگی قژو پێستو چاوو، شێوەی گوێو لوت.
- باسکردنی نیشانە جیاکەرەوەکانی وەك: خالّو شوێنی برینو زکماکی.
- باسکردنی پێوانەی لاشە، بە تایبەت ئەم پانزدە پێوانەیە:

١ – درێژیی بالاّی کەسەکە.

٢ – درێژیی هەردوو بالّی.

٣ – درێژیی بالاّی بە دانیشتویی.

٤ – درێژیی سەری.

٥ – پانیی سەری.

٦ – درێژیی گوێی.

٧ – ماوەی نێوان هەردوو گۆنای.

٨ – درێژیی پێی چەپی.

٩ – درێژیی پەنجەی ناوەڕاستی چەپی.

١٠ – درێژیی پەنجە توتەی چەپی.

١١ – درێژیی باسك و دەستی چەپی بەیەکەوە.

ئەم ڕونکردنەوانەو، وێنەیەکی فۆتۆگرافی لە لاوەو لە پێشەوە دەگیراو هاوپێچ دەکران. ئەمە ئەوپەڕی ئەو زانیاریە بوو لە بارەی ناسینەوەوە پێی گەشتبوون. ئەمەش ئامێری زۆری پێویست بوو، یاخود لەوانەبوو لە پێوانەکاندا هەڵە ڕوبدات، بۆیە ناسینەوەی تەواو ئاستەم بوو. تا لە ساڵی ١٨٨٤ لە بەریتانیا شێوازی پەنجەمۆر بۆ ناسینەوە بەکار هێنرا، ئەوەش وردترین ڕێگای ناسینەوە بوو گومانی تێدا نەبێت.

لەم سەردەمەدا ناسینەوەی زیندوومران گرنگیەکی تاکەکەسی و گشتیشی هەیە، لەوانە: بۆ ناسینەوەی منداڵی تازە لە دایکبووی تێکەڵبوو لەگەڵ منداڵی دیکە. بۆ ناسینەوەی ئەوانەی توشی لەبیرچوونەوە بوون. بۆ ناسینەوەی ئەو داواکراوانەی لە باری تاوانکاریدا پێویستە دەستگیر بکرێن. لە مردنیشدا بۆ ناسینەوەی تەرمی نەناسراو، تا مردنیان تۆمار بکرێت و، ئەگەر داوایان لەسەر بوو داواکە بوەستێنرێ، چونکە دوژمنایەتی بە مردن کۆتایی دێت. دەبێت پێش پشکنینی تەرم و توێکاریکردنی، تەرمەکە بناسرێتەوەو، لە کۆنوسێکدا جێگیر بکرێت، تا لە کاتی پێویستدا بۆی بگەڕێتەوە. لە باری تاوانکاریدا بە ئامادەبوونی پزیشکی دادیی وێنەی فۆتۆگرافی بگیرێت.

**چوارەم: ناسینەوە بۆچی ؟ (١٨).**

لە هەندێك باری دیاریکراودا دادوەرو، لێکۆڵەری تاوان بۆ ناسینەوەی کەسی نەناسراو، پەنا دەبەنە بەر پزیشکی دادیی. لەو بارانەش:

١ – دیاریکردنی شوناسی کەسی زیندوو:

أ – بۆ کەسێکی زانراو بەلاّم گومان لە شوناسی کەسایەتیدا هەیە، یان بەڵگە نامەیەکی فەرمی پێ نییە.

ب – کەسێکی نەناسراو، توشی لە بیرچوونەوە بوبێت، یان ژیریی لە دەست دابێت.

ج – بۆ یەکلا کردنەوەی ئەو کەیسانەی کێشەی وەچەو ڕەچەڵەکیان تێدایە.

د – بۆ سەلماندنی پەیوەندیی خزمایەتی، لە کاتێکدا ئەندامێکی خێزانێك بێسەرو شوێن بووەو، کەسێکیش بانگەشەی ئەوە دەکات کەسە بزربووەکەیە.

٢ – خەملاّندنی تەمەن: کاتێك کەسێك بەڵگەنامەی فەرمی پێنەبێت، یان دیمەنی بەو تەمەنەی نەدەچوو لە بەڵگەنامەکەدا دیاری کراوە، خەملاّندنی تەمەن لەلایەن دادوەریەوە گرنگە، بۆ دیاریکردنی بەرپرسیاریەتی تاوان، یان لەکاتی هاوسەرێتی دا، یان بۆ دایەنیی منداڵ، یان بۆ سەلماندنی باوکایەتی‌و ڕۆڵایەتی.

٣ - دیاریکردنی شوناسی تەرم و ئێسك:

لە کاتی ڕووداوی کوشتنی بەکۆمەڵ و، سوتان و ڕزینی تەرمدا، یان هەڵدانەوەی گۆڕی بە کۆمەڵ‌و، نەناسینەوەی ئێسکەکاندا، داوا لە پزیشکی دادیی دەکرێت کەسایەتی قوربانیەکان دیاری بکات.

**پێنجەم: پزیشکی دادیی‌و ناسینەوە:**

لەو بارانەی پشت بە پزیشکی دادیی دەبەسترێ بۆ ناسینەوە جۆراوجۆرن، لە هەمان کاتدا لایەنی زۆریش هەوڵی بە دەستهێنانی دەدەن، کاتێك بەڵگەی پزیشکیی تەنیا پەناگەی دیاریکردنی شوناسی کەسێك، یان کۆمەڵە کەسانێکە، لەو کاتەدا ڕۆڵ‌و گرنگیی ناسینەوەی پزیشکی دادیی دەردەکەوێت. پزیشکی دادیی بۆ ناسینەوە پشت بەم ئامرازانە دەبەستێت:(١٩).

## ١ – پشکنینی ڕواڵەتی:

أ- دیاریکردنی سیفاتی کەسێتیو توێکاریی گشتی، وەك: ڕەنگی پێست، ڕەنگی چاو، ڕەنگی قژ و شێوەکەی ئایا خاوە یاخود لولە، یان بۆیاخ کراوە.

ب- دیاریکردنی نیشانە جیاکەرەوەکان لە لاشەدا، وەك تێکچونی زکماکیو بوونی شەش پەنجەو، ئاسەواری برینو پێکانو، خاڵی کوتراو، درێژیی باڵاو. بوونی پلاتین لە ئێسکدا.. هتد.

ج- دیاریکردنی ڕەگەزی کەسەکە، -لەو کاتەی تەنیا ئێسکەکەی ماوە-.

٢ – **پشکنین لە ڕێی تاقیگەوە:** پشکنینی خوێنو سپێرم بۆ دیاریکردنی گروپی خوێنو، ترشی ناوکی (D.N.A)و، کرۆمۆسۆم بۆ دیاریکردنی ڕەگەزەکەیو، تیشکی ئێکسی ئێسقان بۆ دیاریکردنی تەمەنی. لەم ڕێگانەوە شوناسی کەسەکە دیاری دەکات.

**لقی دووەم: چیرۆکی دۆزینەوەی پەنجەمۆر:** (٢٠).

لە دۆزینەوەی پەنجەمۆردا –کە هۆکارێك بوو بۆ قەڵاچۆ کردنی تاوانو تاوانباران- ڕۆڵی گرنگ دەگەڕێتەوە بۆ زانای بەریتانی "ولیام هێرچڵ" کە بە فەرمانبەری لە بەریتانیاوە ڕۆشت بۆ هیندستان، هێرچڵ لاشەیەکی لاوازی هەبوو، ساڵی ١٨٥٨ لە ڕۆژێکی گەرمای هیندستاندا توشی نەخۆشی (دیزانتری) بوو بوو، زۆر وەڕەس بوو، لەو ساتەدا لەگەڵ بەڵێندەرێکی بیناسازیدا بە ناوی "ڕاجاردار گۆنای" لەسەر ئەوەی بەڵێندەرەکە گرێبەستێکی میریی واژۆ نەدەکرد دەستەو یەخەی یەکتر بوونو، "هێرچڵ" بە توندی دەستی بەڵێندەرەکەی گرتو خستیە ناو قاپێك مرەکەبو پەنجەکانی خستە سەر گرێبەستەکە، دواتر دانی بەوەدا نا لەو کاتەدا نەیزانی بۆچی ئەوەی کرد، تەنیا ئەوە نەبێت ویستی ئاسەوارێکی بەڵێندەرەکە لەسەر کاغەزەکە بەجێبمێنێ. بەڵام کاتێك سەیری ئەو هێڵو پێچانەی کرد لە دەستی بەڵێندەرەکە بەجێمابوون زانی لە بەردەم شتێکی سەرسوڕهێنەردایە، بۆیە داوای کرد لە کرێکارەکان بە هەمان شێوە –لە بری واژۆ- پەنجەمۆر بکەن. لە ساڵی ١٨٦٢دا ئەرکی پێدانی موچەی بەنگالیە خانەنشین کراوەکانی

سوپای بەریتانی پێسپێرا، بۆ "هێرچڵ" ئاستەنگ بوو ڕواڵەتیان لەیەکتر جیا بکاتەوە، لە هەمان کاتدا ئەوەیشی بۆ دەرکەوت هەندێك لە بەنگالیەکان دەیخەڵەتێنن‌و، لە جارێك زیاتر موچە وەردەگرن، بۆ ڕزگاربوون لەو گرفتە "هێرچڵ" پەنای بردە بەر مرەکەبەکە، هەرکەس موچەی وەردەگرت لەسەر تۆماری موچە پەنجەمۆری پێدەکرد، پاشان بەراوردی پەنجەمۆرەکانی دەکرد، کە بەنگالیەکان بەوەیان زانی دەستیان لە فێڵکردن هەڵگرت. لەوە بە دواوە هێرچڵ هەستی بە بایەخی داهێنانەکەی کرد، پاش ماوەیەك دواتر ژمارەیەك لە هیندی‌و بەنگالیەکانی بانگ کردەوەو پەنجەمۆری پێکردنەوە دیتی پەنجەمۆرەکەیان نەگۆڕاوە. بە دڵنیاییەکی تەواوەوە نوسی بۆ پشکنەری گشتی زیندانەکان لە بەنگال کە مۆری پەنجەکان بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاریان بە سەردا نایەت‌و، وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەوەیشی نوسیبوو بەکارهێنانی لە تۆماری تاوانکاریدا بایەخێکی گەورەی هەیە، بەڵام پشکنەری گشتی بایەخی بە پێشنیارەکەی نەدا، ئەوەش بێهیوای کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی "لەندەن"و، ئەو پەڕاوانەش کۆی کردبوونەوە لەگەڵ خۆی هێنانیەوە.

لە هەمان کاتدا پزیشکێکی سکۆتلەندی بە ناوی "هێنری فۆڵدس" لە یابان لە "نەخۆشخانەی سۆکیجی" لە تۆکیۆ کاری دەکرد، بایەخی زۆری بە پەنجەمۆر دەدا، فۆڵدسیش تێبینی ئەو هێڵ‌و پێچانەی کرد کە هێرچڵ لە هیندستان تێبینی کردبوو، فۆڵدس نوسی یابانیەکان لە ناوچە دواکەوتووەکاندا کە خوێندەواریی تێدا نزمە، دەستیان دەخەنە ناو مرەکەبی سور یان ڕەش‌و، پەڕاوە گرنگەکانیان بە دەست مۆر دەکەن. ئیتر دەستی کرد بە توێژینەوەو، ئەوەی بۆ سەلما مۆری دەستی هەر تاکێك لەوانی تر جیاوازە، لە هاوینی ١٨٧٩دا "فۆڵدس" یەکەم کەس بوو لە ڕێی داکتیلۆگرافیا "نوسینەوەی پەنجەمۆر" مەتەڵی تاوان لێکبداتەوەو شی بکاتەوە. لە ڕوداوێکی دزیکردندا لە تۆکیۆ دزێك بەسەر دیواری ماڵێکدا -بە ڕەنگی سپی ڕەنگ کرابوو- سەرکەوتبوو، کاتێك "فۆڵدس" بەوەی زانیی خاوەن ماڵەکە هەواڵیان پێڕاگەیاند پۆلیس گومان لێکراوێکی دەستگیر کردوە، ئەویش هەڵەکەی قۆستەوەو، لەسەر خۆو بە هێمنی دەستی کرد بە بەراوردی مۆری پەنجەی کەسەکەو پەڵە ڕەشەکەی سەر دیوارکە، بەڵام دوو مۆرەکە هاوجووت نەبوون، "فۆڵدس" پۆلیسی ئاگادار کرد ئەو گومان لێکراوە بێتاوانە، دوای چەند ڕۆژێك پۆلیس

تۆمەتبارێکی دیکەی دەستگیر کرد دانی نا بە تاوانەکەداو، پەنجەمۆرەکەشی لەگەڵ پەڵەی سەر دیوارەکەدا جووت بوو، بەوەش بۆچوونەکەی فۆڵدس ڕاست دەرچوو. پاش چەند هەفتەیەك پۆلیسی تۆکیۆ پەیوەندی کرد بە دکتۆر فۆڵدسەوە لە بابەتێکی دزیکردندا هاوکاریان بکات، ئەمجارە فۆڵدس پەنجە مۆرێکی لەسەر پارچەیەك بۆرسلین دۆزیەوە، لەم جارەدا ڕێکەوت ڕۆڵی خۆی لە ئارەزوەکانی فۆڵدسدا بینی، کاتێك دۆسیەکانی خۆی هەڵدەدایەوە پەنجەمۆرێکی دۆزیەوە هی خزمەتگوزارێك بوو کە پێشتر بۆ تاقیکردنەوە لێی وەرگرتبوو جووت بوو لەگەڵ ئەو پەنجەمۆرەدا، لەو ساتە وەختەدا خزمەتگوزارەکە دانی نا بە تاوانەکەیدا، فۆڵدس دڵنیابوو –وەك چۆن پێشتر هێرچڵ دڵنیابوو- کە ئەم دۆزینەوەیە لە تاوانناسیو ناسینەوەی تاوانبارانددا سود بەخش دەبێت، بۆ ئەوەش وتارێکی نارد بۆ گۆڤاری "ناچەر" دۆزینەوەکەی بە درێژیی باس کردو داوای کرد پەنجەمۆری هەموو تاوانکارە سەرکەشەکان وەربگیرێت، چونکە لەوانەیە لە داهاتوودا سودبەخش بێت بۆ تێگەشتنی تاوانەکان. لەو کاتەی فۆڵدس وتارەکەی بڵاو کردەوە هێرچڵیش گەشتەوە ئینگلتەرا، هێرچڵ زۆر دڵتەنگ بوو چونکە کەسێکی دیکە لە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتە پێشی کەوت، لەکاتێکدا بیست ساڵ لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو بابەتە کردبوو، بۆیە ئەویش وتارێکی بۆ گۆڤاری "ناچەر" نارد، پاش وتووێژێکی زۆر لەسەر سودی بەکارهێنانی پەنجە مۆر، بۆ ماوەی هەشت ساڵ بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ئەو بابەتەدا. بەڵام کەسێك بەناوی " هۆشیر فانسیس گالتۆن" کە زانایەکی دیاری سەردەمی خۆی بوو، بەدواداچون و چاودێری هەڵوێستەکەی دەکرد و موناقەشەی گۆڤارەکەی لەبیر نەچوبویەوە، "گالتۆن" کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندی "پێرمینگهام" بوو، ئامۆزای " چارلز داروین" یش بوو. لە بواری فیزیك و جوگرافیاو باڵیۆن دروستکردندا بەتوانا بوو، بەڵام بایەخی زۆری بە ئەنسرۆپۆلۆجیا (مرۆڤناسی) دەدا، پاش سەرکەوتنی "بیرتیلۆن" لە فەرەنسا، پەیمانگای پاشایەتی لە لەندەن زانایەکی هەڵبژارد چاودێریی کارەکانی "بیرتیلۆن" بکات، بۆ ئەوەش گالتۆنی هەڵبژارد، چونکە لە بواری تایبەتمەندی ڕەگەزەکان و بەراورد کاریدا کاری جوانی کردبوو. لە ڕێی گۆڤاری "ناچەر"ەوە پەیوەندی کرد بە هێرچڵەوە، ئەویش هەرچی پەنجەمۆرو یاداشتی کۆکردبویەوە بۆی نارد، گالتۆن بە خۆیشی دەستی کرد بە پەنجەمۆر کۆکردنەوە، بەوەش گالتۆن بوو بە داهێنەر و دۆزەرەوەی پۆلێنکردنی پەنجەمۆرەکان.

لەساڵی ١٨٨٤ بەشێوەیەکی فەرمی لە بەریتانیا پەنجەمۆر بۆ ناسینەوەی کەسەکان بەکار هات. لەساڵی ١٨٨٨ یشدا کۆڕبەندی زانستیی لە لەندەن بڕیاری دا پەنجەمۆر نیشانەیەکی جیاکەرەوەی کەسەکانە.

**لقی سێیەم: مۆرو جۆرەکانی:**

**یەکەم: مۆر Print چی یە ؟**

لە زماندا واتە نیشانە، شوێنەوار، شوێن پێ.

لە زاراوەدا:

١ – مۆر ئەو شوێنەوارەیە هەر مرۆڤێك لەوانی تر جیادەکاتەوە، هەموو تاکێك مۆری تایبەتی خۆی هەیە لە پەنجەو لەپی دەستداو، لە پەنجەی قاچو ژێر پێداو، لە دەنگداو، لەبۆنداو، لە چاوداو، لە گوێدا. ئەگەر بە ڕەها ناوی مۆر هێنرا مانای پەنجەمۆر دەگەیەنێت. (٢١).

٢ – مۆر Print هەموو لێوارێك لە لێوارەکانی پەنجەی دەستو پێو، ناولەپو، ژێرپێ دەگرێتەوە. بریتییە لە ڕیزێك کونۆچکە نەخشەیەك پێکدێنێت، شوێنەوارێکی سروشتی بەجێ دێڵێت، ئەو هێڵوکونۆچکانە ئارەق دەڕێژنو، شێوەی کونۆچکەکان لەسەر شوێنەکە بەجێدێڵێت، پێی دەوترێ "پەنجەمۆر" هەموو کەس مۆری جیاوازی هەیەو، مۆری هیچ کەس لەوانیتر ناچێت. (٢٢).

٣ – **مۆری بۆماوەیی ( D.N.A):**

ئەو سیفاتە بۆ ماوەییەیە لە ڕەچەڵەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەچەو، لە ڕێگای شیکاریی بەشێك لە ترشی ناوکی " D.N.A"، کە لە خانەکانی جەستەدا هەیە، کەسایەتی هەموو تاکێك دیاری دەکرێت. (٢٣).

## دووەم: جۆرەکانی مۆر:

پەنجەمۆر لەم سەردەمەدا گۆڕەپانێکی فراوانەو، بۆ ناسینی زیاتری نهێنیو تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ لە کەیسە وردو هەستیارەکان دەکۆڵێتەوە. ئەم جیاوازیە بێ کۆتایەی زیندەوەران یەکێکە لە بەڵگەکانی دەستەڵاتی خوای گەورە، گرنگترین جۆرەکانی مۆریش ئەمانەی خوارەوەن:

### ١ – مۆری پەنجەکان:

ئەو مۆرانەن کاتێك پەنجەکان بەر ڕوویەکی ساف دەکەون بەجێی دێڵن. ئەو مۆرانەش وەك شێوەی ئۆرجینالی (بنەڕەتی) ئەو هێڵانەیە کە سەری پەنجەکانیان داپۆشیوە، ئەو هێڵانەش لە نێوان دوو کەسو هەتا لە نێوان پەنجەکانی کەسێکدا بە هیچ شێوەیەك لە یەك ناچن. (٢٤).

### ٢ – مۆری گوێ:

ئەو نیشانە دیارو خاڵە جیاوازانەیە لە گوێدا، کە هەرگیز دووبارە نابێتەوە، گوێ لە هەموو ئەندامەکانی دیکەی لەش زیاتر کەسایەتی تاکێك دەنوێنێ، چونکە بە درێژایی ژیانو دوای مردنیش شێوەی ناگۆڕێتو، لە ئاستی تاکەکانو خودی کەسێکیشدا دووبارە نابێتەوە.(٢٥).

### ٣ – مۆری چاو:

نزیکەی دە ساڵە پزیشکەکان ئەم مۆرەیان دۆزیوەتەوە، مۆری چاو لە مۆری پەنجە وردترە، چونکە هەر چاوێك تایبەتمەندی خۆی هەیەو، مۆری هیچ چاوێك لە چاوێکی تر ناچێت.(٢٦).

### ٤ – مۆری ددان:

ئەو شوێنەواریە بە شێوەی نیشانە لە تاوانبار بەجێ دەمێنێ، لە کاتی گازگرتنی لە جەستەی قوربانیەکە، یان لە خواردنێك. گرنگیی لەوەدایە تاماوەیەکی زۆر ناگۆڕێتو،

بەرگەی ڕزینو شیبونەوەو پلەی گەرمیی بەرز دەگرێت، سەلماوە دەدان بەرگەی چوار سەد پلەی گەرمیی دەگرێت. (٢٧).

٥ – مۆری دەنگ:

لێکۆڵینەوە زانستیەکان سەلماندویانە دەنگەکانیش وەك مۆرەکانی دیکە جیاوازن و، هەرکەس لە دایك دەبێت دەنگی تایبەت بەخۆی هەیەو، لەرینەوەی دەنگەکان لە یەکتر جیاوازن. (٢٨).

٦ – مۆری بۆن:

هەموو مرۆڤێك بۆنی تایبەت بە خۆی هەیەو، بۆنی هیچ کەسێك لە بۆنی کەسی تر ناچێتو، هەموو کەس بە بۆنی تایبەتی خۆیەوە لە دایك دەبێت. (٢٩).

٧ – مۆری لێو:

مۆری لێو بەو چرچو لۆچانە دەوترێ کە لە لێوی کەسێکدایە، لە شێوەو پێکهاتەکەیاندا لە نێوان تاکەکاندا جیاوازن. ئەو چینە پێستەی لێوی داپۆشیوە تایبەتمەندی خۆی هەیەو، لە بواری دۆزینەوەی تاواندا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. (٣٠).

٨ – مۆری بۆماوەیی ( D.N.A):

کورتکراوەی ناوی زانستیی ئەم ترشەیە ( Deoxyribo Nucleic Acid)، بۆیە پێی دەوترێ ترشی ناوکی چونکە هەمیشە لەناو ناوکی خانەکانی هەموو بوونەوەرە زیندوەکاندا جێگیر دەبێت، هەر لە بەکتریا تا کەڕوو، ڕووەكو، ئاژەڵو، مرۆڤ، تەنیا لە خڕۆکە سورەکانی خوێندا نەبێت نییە، ئەویش لەبەر ئەوەی خڕۆکە سورەکان ناوکیان نییە، ترشی ناوکیی لە ناو ناوکی خانەکاندا بەشێوەی کرۆمۆسۆم هەیە، هەموو زانیاریو سیفاتە بۆماوەییەکانی زیندەوەران بەشێوەی کۆد (شیفرە) لەسەر گەردیلەی ترشی ناوکی جێگیرە، ئەمەش هەر لەسەرەتای پێکهاتنی هەموو زیندەوەرێکەوە بەرنامەی بۆ داڕێژراوە. (٣١).

## سێیەم: سەرچاوەکانی مۆری بۆماوەیی: ( ٣٢ ).

دەتوانین بڵێین هەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ کە ترشی ناوکیی تێدایە بە سەرچاوەی مۆری بۆماوەیی دادەنرێن، لەگەڵ ئەوەشدا زانایان ژمارەیەك شوێنیان لە جەستەدا دیاری کردوە دەکرێت مۆری بۆماوەییان لێ دەربهێنرێ، ئەوانەش ئەمانەی خوارەوەن:

١ – خوێن: خوێن ئەگەر شل بێت، یان وشك بێت، بە گرنگترین سەرچاوەی مۆری بۆماوەیی دادەنرێ، لە ڕێیەوە شوناسی تاوانبار دیاری دەکرێت.

٢ – سپێرم: شلەی سپێرم خانەی زیندوی تێدایە پێی دەوترێ "بیماتۆریا" کە بە بناغەی سەرەکیی دادەنرێت لە پشکنینی شوێنەواری سپێرمدا. لە دۆزینەوەی تاوانباری سێکسیدا سپێرم سەرچاوەی سەرەکیەو، ترشی ناوکی بە شێوەیەکی سەرەکیی لە سەری گیانەوەری سپێرمدایە.

٣ – ئێسكو ددان: لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە دەتوانرێت بە سەرکەوتوویی (D.N.A ) لە ئێسکێك دەربهێنرێت کە تەمەنی هەزاران ساڵ بێت، ئێسكو ددان گرنگترین سەرچاوەی شیکاریی مۆری بۆماوەیین.

٤ – شانەکانی پێستو نینۆك: شانەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە سەرچاوەی سەرەکیی مۆری بۆماوەیین، چونکە لەو خانانە پێکدێن ناوکەکانیان ترشی ناوکی ( D.N.A) یان تێدایە. دۆزینەوەی پارچەیەك نینۆك یان شانەی تاوانبار دەکرێت شیکاریی بکرێتو، مۆری بۆماوەیی لێ دەربهێنرێ.

٥ – موو: موو بوارێکی فراوانی دەستخستنی مۆری بۆماوەییە، لە پێشتردا موو بۆ زانینی تەمەنو ڕەگەزی مرۆڤ بەکار دەهێنرا، بەڵام ئەمڕۆ بۆ سەلماندنی تاوان وەك بەڵگە بەکار دێت. ڕەگو سەلکی مووەکان ترشی بۆماوەییان تێدایە.

٦ – لیك‌و تف: لیك خۆی خانەی تێدا نییە، بەڵام جۆرێك خانە –ڕووكەشە خانەكان- له دیواری پشتی دەمەوە هەن‌و دەلكێن بە لیك‌و تفەوە، لەو ڕێگاوە شیكاریی ترشی بۆماوەیی دەكرێت.

٧ – عەرەق‌و میز: ئەو ڕووكەشە خانانەی لەگەڵ عەرەق‌و میزدا دادەبەزن سەرچاوەی گرنگی ترشی ناوكین.

**چوارەم: جیاوازیی مۆری بۆماوەیی و مۆرەكانی دیكەی جەستە: ( ٣٣ ).**

پاش دیاریكردنی مۆرەكانی لاشەو مۆری بۆماوەیی، دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا جیاوازیی نێوانیان بخەینە ڕوو:

**١ - جیاوازیی له سروشتیاندا:**

مۆری بۆماوەیی سروشتی بایەلۆجی هەیەو، لەسەر بناغەی بۆماوەیی ڕاوەستاوە، له باوانەوە بۆ كەسەكە بەجێ دەمێنێ . بەڵام مۆرەكانی تری لاشە ئەو سروشتەیان نییەو، بە زۆریی كاریگەریی بۆماوەییان لەسەر نییە. زانایان له كۆنگرەی مێژووی سروشتیی تاوانكاریی مرۆڤ له (تۆرینۆ) له ئیتالیا له ساڵی ١٩٠٦ ئەوەیان بەم شێوە یەكلا كردەوە، پاش لێكۆڵینەوەیەكی قوڵ لەسەر پێنج نەوەی یەك خێزان دەركەوت مۆری پەنجەكانی تاكەكانی هیچ كاریگەرییەكی بۆماوەییان لەسەر نییە. – واتە مەرج نییە له مۆرەكانی تردا هەمیشە وەك ڕەچەڵەكی دەربچێت، بەڵام مۆری بۆماوەیی هەمیشە ناگۆڕێت-.

**٢ - جیاوازیی له فەرماندا:**

لەگەڵ ئەوەی مۆری بۆ ماوەیی و مۆرەكانی تر له بواری سەلماندنی كەسایەتی تاكەكان و ناسینەوەی تاوانباراندا یەك دەگرنەوە، بەڵام له چەند ئەرك‌و فەرماندا لەوان جیاوازە، وەك:

سەلماندنی بوون و نەبوونی ڕەچەڵەك و، له بواری كۆچ و شوناسنامە داو، له ناسینەوەی شوێن بزربووەكانداو، له ناسینەوەی قوربانیانی جەنگ و ڕووداوە

سروشتیەکانو، لە تاوانە سێکسیەکانداو، هەروەها لە بواری توێژینەوەی زانستیو، چارەسەرو، دەستنیشان کردنی نەخۆشییە بۆ ماوەییەکانو، دیاریکردنی بنەچەی ڕووەك و ئاژەڵدا بەکاردێت. بەڵام مۆرەکانی دیکە لە وانەی سەرەوەدا بەکار نایەن، چونکە فەرمانەکانیان جیاوازە.

٣ - جیاوازیی لە سەلماندندا:

مۆری بۆماوەیی لە پرۆگرامو میتۆدی سەلماندندا لە مۆرەکانی دیکە جیاوازە، مۆرە جەستەیەکان لە سەلماندنی کەسایەتیدا پشت بە شێوە دەرەکیەکەو، جیاوازیی نێوانیان دەبەستن، بەڵام مۆری بۆماوەیی لە شیکاری بەشێك یان زیاتر لە ترشی ناوکی پشت بە توخمە نایترۆجینیەکان دەبەستێت.

لقی چوارەم: بەکارهێنانی مۆرەکانو پزیشکی دادیی: (٣٤).

بە هۆی پێشکەوتنی زانستو دۆزینەوەی مۆرە جیا جیاکانو، بە تایبەت مۆری بۆماوەیی، بۆ یەکلاکردنەوەی ڕاستیەکانو، دۆزینەوەی تاوانبارانو، دەرخستنی بێتاوانی تۆمەتبارکراوێك، بەڵگەی پزیشکی دادیی یەکلاکەرەوەی ئەو کەیسانەیە کە دادوەر بۆی یەکلا ناکرێتەوەو، بۆ ئەو مەبەستە پشت بە پزیشکی دادیی دەبەستێت، بۆیە پزیشکی دادیی بە یەکێك لە پارێزەرانی مافو دادپەروەریی دادەنرێت.

١ – لە بواری ناسینەوەی شوناسی کەسێکدا: لەو کەیسانەی لەبەر نەناسینی تاوانبار کەیسەکە دادەخرێت، هۆکارێکە بۆ ناسینەوەی کەسی تاوانباری نەناسراو، لە هەمان کاتدا هەندێك گومان لێکراویش لە بازنەی گومان دەردەکاتو، لە یەکلاکردنەوەی داوا تاوانکاریەکاندا هاوکاریی دادوەریی دەکات.

٢ – لە بواری ناسینەوەی تەرمو ئێسکدا: لە کاتی ڕوداوی سروشتیو، جەنگو، کۆکوژیو، گۆڕی بەکۆمەڵو، خەڵکی بێسەروشوێندا مۆری بۆماوەیی بەڵگەی یەکلاکەرەوەی دیاریکردنو، ناسینەوەیە.

٣ – له بواری سەلماندنو نەسەلماندنی وەچەو ڕەچەڵەكدا: بۆ هەر مەبەستێكی تایبەت كەسێك لافی ئەوە لێ دەدات گوایە منداڵی كەسێكە، یان خزمی كەسێكە، یان كەسێك منداڵی ئەوە، یان منداڵی ئەو نییە، له هەموو ئەوانەدا مۆری بۆماوەیی ڕۆڵی گرنگی هەیە له سەلماندنی ڕاستیەكەداو، گرینەیەكی بەهێزە بۆ بەردەم دادوەرو، زۆرێك له ئارێشەكان لەو ڕێگایەوە چارەسەر دەبن.

٤ – له بواری تاوانە جۆراوجۆرەكاندا: دەكرێت له پاشماوەو شوێنەواری بەجێماو له تاوانبار له تاوانەكانی كوشتنو، دزیكردنو، دەستدرێژیو، ڕفاندندا، كەسی تاوانكار بدۆزرێتەوەو، وەك بەڵگەیەكی ماددی بەكار بهێنرێت، چونكە هەموو چالاكیەكی تاوانكاریی سروشتی ماددی هەیەو، له بەركەوتنی دوو تەن پاشماوە بەجێدەمێنێ، لێرەوە تاوانبار ڕادەستی دادگاو دادپەروەریی دەكرێتو، بە سزای خۆی دەگات.

٥ – له بواری تاوانە سێكسیەكاندا: وەك زیناو، زەوتكردنو، تاوانی ئابڕووبەردا دەتوانرێت تاوانبار دیاریو، دەستنیشان بكرێت.

٦ – له بواری چارەسەری پزیشكیدا: پزیشكەكان بەردەوامن له توێژینەوە له سەر ترشی ناوكی (D.N.A)و، بەكاری دێنن بۆ دۆزینەوەی ئەو میكرۆبانەی هۆكاری نەخۆشینو، دیاریكردنی نەخۆشیە بۆماوەییەكاو، بۆ پێشخستنو پەرەپێدانی چارەسەر بۆ نەخۆشیەكان.

### لقی پێنجەم: سەلماندنو گرنگیەكەی:

### یەكەم: پێناسەی سەلماندن له یاسادا:

أ – سەلماندن له بابەتی مەدەنیدا: بریتی یە له هێنانەوەی بەڵگە له بەردەم دادوەریدا بەو شێوەی یاسا دیاری كردوە، لەسەر بوونی ڕوداوێكی یاسایی ئاسەواری لێ بكەوێتەوە.

ب – سەلماندن له بابەتی سزایدا: هێنانەوەی بەلگەیە بۆ دەستەلاتی تایبەتمەند بە رێکارە سزایەکان لەسەر راستیی رووداوێك بایەخی یاسایی هەبێت، ئەوەش بە پێی ئەو رێگایانەی یاسا دیاری کردووە، بە پێی ئەو رێسایانەی یاسا پەیڕەوی دەکات. (٣٥).

بە گشتیی سەلماندن بەلگە هێنانەوەیە لەسەر روودان و روونەدانی تاوانێك، لە لایەن نەیارەکانەوە دەدرێتە پاڵ تاوانبارێك، یان بێتاوانی تۆمەتبارێکی پێدەسەلمێنرێ و، دادوەریش لە بڕیارداندا پشتی پێدەبەستێت.

**دووەم: گرنگیی سەلماندن لە دادوەریدا** : (٣٦).

أ - لەبەر ئەوەی قۆناغی حوکمدان لە داوادا قۆناغی یەکلا کەرەوەیە و، چارەنوسی کۆتایی داواکەی لەسەر دەوەستێت و، تاوانبارکردن و بێتاوانیی تۆمەتبار لە یەکتر جیا دەکاتەوە و، بە دروستبوونی یەقین بۆ دادوەر حوکمی تاوانبارکردن دەدات و، بە دروستبوونی گومانیش حوکمی بێتاوانی دەدات. بناغەی هەموو ئەوانەش بوونی بەلگەی سزاییە.

ب – گرنگیی سەلماندن لە بابەتە سزایەکاندا زۆرترە، چونکە تاوان زیان بە ئاسایشی کۆمەلگە و دەستەلات دەگەیەنێت، بۆیە دەستەلاتی دەوڵەت شوێن تۆمەتبار دەکەوێت تا سزای بدات.

ج – گرنگیەکی تری سەلماندن لەوەدایە، تاوان رووداوێکە لە رابردوودا رویداوە و، دادگا ناتوانێت بە چاوی خۆی بیبینێ و، لە راستیەکەی تێبگات، دادوەریش بۆ دادگایی کردن پشت بەو هۆکارانە دەبەستێت کە دەخرێتە بەردەستی، ئەو هۆکارانەش بەلگەکانی سەلماندنە.

د – ماف ئەگەرچی لە بنەڕەتیشدا هەبێت، بە مردوویی دەمێنێتەوە و، هیچ نرخ و سود و بەهایەکی پراکتیکی نییە و، بوون و نەبوونی وەکویەك وایە و، هیچ حوکمێکی پێدەرناکرێت. ئەگەر هاتوو بە ئامرازی سەلماندن نەخرێتە بەردەستی دادوەر.

**سێیەم: گرنگیی سەلماندنی سزایی لە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ: ( ٣٧ ).**

أ – پێشکەوتنی تەکنەلۆژی بووەتە هۆی پێشکەوتنی ئامرازەکانی سەلماندن‌و، زانینی ڕاستیی تاوانەکان.

ب – سەلماندنی زانستیی قەتیس نەماوە لەسەر یەك بەڵگە، بەڵکو پەلی هاوێشتووە بۆ هەموو بەڵگەکان‌و، هەموو ئەوانەی سودیان لێ دەبینرێ بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان، ئیتر حەقیقەتی تاوانبار بێت، یان تاوانەکە، شارەزا بە ڕاپۆرتێکی هونەریی دەیخاتە ڕوو.

ج – پێشکەوتنی تەکنەلۆژی بووەتە هۆی بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانەی کە ڕاستیەکان بە شێوەیەکی زۆر ورد دەردەخات، وەك مۆری بۆماوەیی.

د – گرنگیی سەلماندن تەنیا لەسەر توخمە ماددیەکانی پێکهێنەری تاوانەکە ناوەستێت، بەڵکو سەردەکێشێ بۆ پرسە مەعنەویەکانیش، بەتایبەت باری ژیریی‌و دەروونی، بۆ ڕوونکردنەوەی بنەماکانی بەرپرسیارێتی سزایی بۆ دیاریکردنی سزای شیاو. بۆیە پێویستە بۆ دیاریکردنی باری تەندروستی تۆمەتبار پشت بە پزیشك ببەسترێ.

هـ – سەلماندنی زانستیی پشت بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی دەروونی‌و زانستیی دەبەستێت، بۆیە پێویستە لە هەندێك پرسدا بۆ دەستکەوتنی ئەنجامێك بە شێوەیەکی بابەتی‌و، بە پێی پێوەری زانستیی دادوەری تاوانەکان پەنا بۆ پسپۆڕان ببات.

و – لەم سەردەمەدا بەڵگەی ماددیی گرنگیەکی گەورەی هەیە، بە تایبەت پێشکەوتنی ئامرازەکانی توێژینەوەی نوێ، وایکردوە ئەم بەڵگە زانستیانە لە پێشەوەی هەموو بەڵگە تاوانکاریەکانەوە بێت.

## لقی شەشەم: هەوڵە یاسایەکان بۆ سەلماندن بە مۆری بۆماوەیی:

### یەکەم: پاساوی بەکارهێنانی مۆری بۆماوەیی:

ڕێگادان بە پشکنین بە مۆری بۆماوەیی بەستراوە بە گەورەیی ئەو تاوانەی شایانی بەکارهێنانی ئەم پشکنینەیە، ترسناکیی ئەنجامدانی پشکنین بە مۆری بۆماوەیی سەرەڕای تایبەتمەندی بایۆلۆژی، لە هەمان کاتدا پەیوەندی بە مافی مرۆڤیشەوە هەیە لە پاراستنی جەستەییدا، بۆیە ئەم تەکنیکە بۆ ئەو تاوانانە بەکاردێت کە گەورەو ترسناکن، لەبەر ئەوە زۆربەی یاساکان بە مەرجیان داناوە بەکارهێنانی مۆری بۆماوەیی لە سەلماندندا دەبێت بۆ تاوانی گەورە بێت. ماددەی "١٥٦"ی یاسای ڕێکارە سزایەکانی فەرەنساو، ماددەی "٦٢" ی هەمان یاسای ئینگلیزی بە مەرجیان گرتووە مۆری بۆماوەیی لە تاوانێکدا بەکاردێت کە سزاکەی زیندانی بێت، یان بەندکردن (حبس) بۆ ماوەی (٥) ساڵ کەمتر نەبێت. (٣٨).

یاسادانەری عێراقیش بە مەرجی داناوە وەرگرتنی سەمپڵ (نمونە) لە لاشەی تۆمەتبار، یان قوربانی بە مەبەستی سەلماندن دەبێت لەو گوناهانەدا بێت کە جۆری تاوانی گەورە، یان کەتن بێت. لە ماددەی (٧٠)ی **قانون اصول المحاکمات الجزائیة** دا دەڵێ: ﴿ دادوەری لێکۆڵینەوەو، لێکۆڵەر لە تاوانی گەورەو کەتندا بۆیان هەیە تۆمەتبارو تاوان لێکراو ناچار بکەن لاشەی دەربخاتو، وێنەی هەتاوی بگیرێت، یان پەنجەمۆری پێبکرێت، یان کەمێك خوێن، یان موو، یان نینۆك، یان هەر شتێکی تر کە سود بە لێکۆڵینەوە دەگەیەنێت لێی وەربگیرێتو، پشکنینی پێویستی لەسەر بکرێت. دەبێت بە پێی توانا مێینە پشکنین بۆ لاشەی مێینە بکات.﴾. (٣٩).

### دووەم: هەوڵە یاسایەکان بۆ ڕێکخستنی مۆری بۆماوەیی لە سەلماندندا :

#### أ – هەوڵە نێودەوڵەتیەکان:

١ – **لیژنەی ئەنجومەنی ئەورووپی:** کاری ئەم لیژنە سێ ساڵی خایاند (١٩٨٩-١٩٩٢)، بەم شێوە ئامانجی خۆی دیاری دەکات: " ئامانجی سەرەکیی ئەم لیژنەیە پڕکردنەوەی ئەو بۆشایە سیاسیو یاساییەیە کە لەوانەیە لە پێشکەوتنی خێرای زانستی

بایۆلۆژی دروست ببێت...." ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ڕاسپاردەکانی ساڵی ١٩٩٢ یە، کە پەیوەندی بە تاقیکردنەوەی جینەکانەوە هەیە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی سزایی...(٤٠).

٢ – **ڕاگەیاندنی کۆنگرەی جیهانیی ڕێکخراوی یونسکۆ:** لە بارەی مۆری بۆماوەیی و مافی مرۆڤ لە ١٩٩٧/١١/١١ لە دیباجەیەك و بیست و پێنج خاڵدا ڕایگەیاند: مۆری جینەکانی مرۆڤ و، ئەنجامە پراکتیزەکراوەکانی گۆڕەپانێکی فراوانی لە بەردەم پێشکەوتنی تەندروستی تاکەکاندا کردەوە، بەلام ئەم توێژینەوە دەبێت ڕێز لە مافی مرۆڤ و ئازادیە بنەڕەتیەکانی بگرێت...(٤١).

٣ – **ئەنجومەنی ئەوروپی:** لەسەر پێشنیاری وەزیرانی دەوڵەتە ئەندامەکان لە ١٩٩١/٢/٢٢، ئەنجومەن ڕاسپاردەی ژمارە ( ڕـ٩٢ـ١ )ی دەرکرد، کە چەند پرەنسیپێك لە بواری دادپەروەریدا لەخۆ دەگرێت. لە پرەنسیپی سێیەمدا دەڵێ: بەکارهێنانی شیکاری مۆری بۆماوەیی (D.N.A) تەنیا بۆ مەبەستی توێژینەوەی تاوان بەکار دێت و، دەبێت لە سنوری ئەوانەشدا لێکۆڵینەوە بکەن. (٤٢).

٤ – **ڕێکخراوی جیهانی ئیسلامی بۆ زانستی پزیشکی:** لە نەدوەی فیقهی پزیشکیی پانزەهەمی ڕێکخراوی ئیسلامی بۆ زانستی پزیشکی لە ٥-٢٠٠٢/١/١٠ دەڵێ: نەدوە باسی بابەتی مۆری بۆماوەیی کرد، لە لایەنی زانستیەوە ئامرازێکە لە لێکۆڵینەوەی باوانی بایۆلۆژی و کەسایەتیدا هەڵە ناکات، بە تایبەت لە بواری پزیشکی دادییدا. بۆیە دەگاتە ئاستی گرینەی یەکلاکەرەوەی بڕێنەرەوە...(٤٣).

**ب – هەوڵە ناوخۆییەکان:**

کەمینەیەك لە وڵاتان لە یاساکانیاندا بایەخیان بە سەلماندن لە ڕێی مۆری بۆماوەیی داوە، وەك: فەرەنسا لە یاسای سزادانی نوێی ساڵی ١٩٩٤ و، ئەمریکا لە یاسای جینۆمی ئەمریکی ساڵی ١٩٩٠ و، ئەڵمانیا لە (لیژنەی گەڕان بە دوای ڕاستیەکان)ی ئەڵمانی ساڵی ١٩٨٧ و، یاسای ئینگلیزی و ئیرلەندی لە ماددەکانی (٦٢-٦٣)ی پۆلیسی بەلگەکانی تاوانی ساڵی ١٩٨٤ داو، لە یاسای هۆڵەندیداو، لە یاسای سویدیداو، نەرویج لە ماددەی (٥٧)ی

یاسای ڕێکاری سزایی ساڵی ١٩٨٦ . بەڵام زۆربەی وڵاتان لە ڕێی دادوەرییەوە دانیان ناوە بە سەلماندن لە ڕێی مۆری بۆماوەیی. (٤٤).

## سەرچاوە:

---

١ – د. محيى هلال السرحان، النظرية العامة للقضاء في الإسلام، الناشر مركز البحوث والدراسات الإسلامية، بغداد، سنة الطبع ٢٠٠٧م، ص٢٦٨.

٢ – د. عبدالفتاح بيومي حجازي، أصول التحقيق الإبتدائي أمام النيابة الإدارية، المركز القومي للإصدارات القانونية، القاهرة، طبعة أولى، سنة ٢٠١١م، ص١٩٠.

٣ – د. براء منذر كمال عبداللطيف، شرح قانون أصول المحاكمات الجزائية، دار ابن الاثير للطباعة والنشر، الموصل، الطبعة الثانية، ٢٠١٠م، ص١٣٧.

٤ – د. عبدالحكم فودة، حجية الدليل الفني في المواد الجنائية والمدنيةو، الناشر دار الفكر الجامعي، الأسكندرية، مصر، الطبعة الأولى، سنة الطبع ٢٠١٤م، ص٩-١٠.

٥ – المستشار منير رياض حنا، الطب الشرعي، الناشر دار الفكر الجامعي، الأسكندرية، مصر،طبعة أولى، سنة ٢٠١١م، ص٢٤.

٦ – قانون الطب العدلي رقم (٣٧) لسنة ٢٠١٣، المنشور في الوقائع العراقية عدد (٤٢٩٥) في ٢٠١٣/١٠/٢٨.

٧ – د. جابر مهنا الحسيناوي؛ المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية، ص٤٤٦.

٨ – د. جابر مهنا الحسيناوي؛ ص٤٤٨ .

٩ – د. منصور عمر المعايطة؛ الطب الشرعي في خدمة الأمن والقضاء، ص٢٧.

١٠ – د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعي، ص٣٧.

١١ – د. صفاء عادل سامي؛ حجية البصمة الوراثية في الإثبات الجنائيي، منشورات زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٣، ص٢٥٠-٢٥٣. و القاضي عثمان ياسين علي؛ المبادئ القانونية في قرارات محكمة تمييز اقليم كوردستان- العراق القسم الجنائي لمدة ١٩٩٣-٢٠٠٧، منشورات إتحاد قضاة إقليم كوردستان العراق، أربيل،الطبعة الأولى، ٢٠٠٨، ص٤٥-٤٨. و ابراهيم المشاهدي نائب رئيس محكمة التمييز؛ المبادئ القانونية في قضاء محكمة التمييز القسم الجنائي، الناشر: شهاب احمد الحميد، بغداد، ١٩٩٠، ص١٦.

١٢ – د. براء منذر كمال عبداللطيف، شرح قانون أصول المحاكمات الجزائية، ص١٤٣.

١٣ د. عبدالحكم فودة، حجية الدليل الفني في المواد الجنائية والمدنية، ص٢٢.

١٤ – المحامي نصر شومان؛ التكنولوجيا الجرمية الحديثة وأهميتها في الإثبات الجنائي، بدون مكان طبع، الطبعة الأولى، ٢٠١١، ص٢٢٩_٢٣٠.

١٥ – د. كاظم المقدادى؛ الطب العدلى والتحرى الجنائى، ص٨٢.

١٦ – د. منير رياض حنا؛ الطب الشرعى، ص١٠١_١٠٣.

١٧ – د. منير رياض حنا؛ ص٩٨_١٠٠.

١٨ – د. منير رياض حنا؛ ص٨٩_١٨٥ و، د. منصور عمر المعايطة؛الطب الشرعى فى خدمة الامن والقضاء، ص٢١٣_٢٢٩.

١٩ – د. منصور عمر المعايطة؛ ص٢١٧_٢٢٤.

٢٠ – د. منير رياض حنا؛ ص١١٣_١١٦.

٢١ – د. صفاء عادل سامي؛ حجية البصمة الوراثية في الإثبات الجزائي، منشورات زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٣، ص٧٠، و د. عبدالرحمن أحمد الرفاعي؛ البصمة الوراثية وأحكامها في الفقه الإسلامي والقانون الوضعي، منشورات الحلبي الحقوقية، لبنان، الطبعة الاولى، ٢٠١٣، ص٣٧.

٢٢ – د. كاظم المقدادي؛ الطب العدلي، ص٥٢.

٢٣– د. صفاء عادل سامي؛ ص٧٣.

٢٤ – د. صفاء عادل سامي؛ ص٩٩.

25 - د. عبدالرحمن أحمد الرفاعي؛ ص٧٨.

٢٦ – د. منير رياض حننا؛ الطب الشرعي، ص٢٥٩.

٢٧ – د. عبدالرحمن أحمد الرفاعي؛ ص٧٩.

٢٨– د. صفاء عادل سامي؛ ص١٠٠.

٢٩ - د. صفاء عادل سامى؛ ص١٠٠.

٣٠ – د. عبدالرحمن احمد الرفاعي؛ ص٨٠.

٣١ – د.كاظم المقدادي؛ ٥٤.و د. عبدالرحمن الرفاعى؛ ص٣٨.

٣٢– انظر د. عبدالرحمن احمد الرفاعي؛ ص١٦٦-١٧٠. و د. صفاء عادل سامي؛ حجية البصمة الوراثية في الإثبات الجزائي، ص٩٤-١٠٢.

٣٣ – د. عبدالرحمن احمد الرفاعي؛ ص٨٣-٨٦، و د. صفاء عادل سامي، ص١٠٢. ود. منير حنا رياض؛ ص١١٧.

٣٤ – انظر د. عبدالحمن الرفاعي؛ ص١٨٩-٢١٥و د. منير رياض حنا؛ص٢٠٥-٢٠٨و د. صفاء عادل سامي؛ ص١٦٤ ١٦٩.

٣٥ – د. صفاء عادل سامي؛ ص١٨.

٣٦ – د. صفاء عادل سامى؛ ص٢٠-٢٢.

٣٧ – المحامي نصر شومان؛ ص٢٠٩-٢٢٣.

٣٨ – د. صفاء عادل سامي؛ ص١٥٥.

٣٩ – قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقية، اعداد القاضى نبيل عبدالحمن؛ ص٢٨.

٤٠ – د. صفاء عادل سامي؛ ص١٧٧.

٤١ – د. صفاء عادل سامى؛ ص١٧٨.

٤٢ – د. عبدالرحمن احمد الرفاعي؛ ص٣٣٢.

٤٣ – د. عبد الرحمن احمد الرفاعى؛ ص٢٢٠-٢٢١.

٤٤ – انظر د. عبدالرحمن احمد الرفاعي؛ ص٣١٨-٣٤٤، و د. صفاء عادل سامي؛ ص١٦٩ ١٨١.

# بەشی چوارەم: پزیشکیی دادیی و بەڵگەکانی تاوان:

ئەم بەشە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە پزیشکی دادیی چ ڕۆڵێکی هەیە لە گونجاندنی یاسایی ڕووداوەکان کە گرنگترین خاڵی دادوەرییە، کە دادوەر بۆ هەر تاوانێك وەسفی یاسایی خۆی بۆ دابنێت و بڕیاری دروستی تێدا بدات، لەگەڵ ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە بەڵگە هێنانەوەدا لەسەر بوون و نە بوونی تاوانێك. ئەمەش خۆی لە دوو تەوەردا دەبینێتەوە:

**تەوەری یەکەم: ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە گونجاندنی یاسایی ڕوداوەکاندا (التكييف):**

**تەوەری دووەم: ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە بەڵگە هێنانەوەدا (إقامە الدليل):**

# تەوەری یەکەم: رۆڵی پزیشکیی دادیی لە گونجاندنی یاسایی ڕوداوەکاندا:

## لقی یەکەم: گونجاندنی یاسایی چی یە؟ (١).

١ – **لە فیقهی میصریدا** بەم شێوە پێناسەی گونجاندن کراوە: گونجاندن ڕونکردنەوەی حوکمی ئەو دەقە یاسایەیە کە ڕوداوەکە دەیگرێتەوەو، حوکمی دەکاتو، سزای لەسەر دەدات. یان گەڕاندنەوەی ڕوداوەکەیە بۆ دەقێکی تاوانکارییو، پێدانی ناوە یاسایەکەی خۆی.

٢ – **لە فیقهی فەرەنسیدا** بەم شێوە پێناسەی گونجاندنی یاسایی دەکرێت: گونجاندن پرۆسەیەکی یاساییە، دادوەر تیایدا دەگەڕێت بە شوێن ئەو ناوە یاساییەدا کە پێویستە بیبڕێت بە بەری ئەو کردارەدا کە هاتووەتە بەردەستی، بەم پرۆسەیەش کردارەکە ناوی یاسایی تایبەت بە خۆی وەردەگرێت. گونجاندن ئەو کردارەیە لە میانەی دەقە تاوانکاریەکەوە سزای لە سەر دەدەرێت.

کەواتە گونجاندنی یاسایی توێژینەوەی دادوەرە لەسەر ئەوەی ئایا ئەو کارەی تۆمەتبار ئەنجامی داوە بە پێی وەسفی یاسایی، توخمەکانی یاساو پایەکانی تاوانی تێدایە.

گونجاندنی یاساییش کراوە بە چەند بەشێکەوە. لە بارەی بابەتەکەوە: گونجاندنی تاوانەکە، ئایا ( سەرپێچی یە، کەتنە، تاوانی گەورەیە). لە بارەی کەسەکەشەوە ئایا بەرپرسیارێتی یاسایی لەسەرە؟ بە ئەنقەست ئەو تاوانەی ئەنجام داوە، یان بە ڕێکەوت دروست بووە؟

## لقی دووەم: گرنگیی گونجاندنو ڕۆڵی پزیشکی دادیی لە کاری دادوەردا:

گونجاندن ئەو گرفتەیە لە لقە جیا جیاکانی یاسادا خۆی بەسەر لێکۆڵەرو، دادوەرو، توێژەردا دەسەپێنێ. لە یاسای سزاییدا دەبێت وەسفی ئەو کردارە بکرێت کە تۆمەتبار ئەنجامی داوە، بۆ ئەوەی بزانرێت چ جۆرێکە، بۆ نموونە: کاتێك فەرمانبەرێك پارەیەك

**دەبات، دەبێت جیا بکرێتەوە ئایا ئەو کارە: دزی یە، بەرتیلە، خیانەتی ئەمانەتە، ئیختلاسی سامانی دەوڵەتە ؟ لێرەدا گرنگیی گونجاندن لە بواری یاسا سزاییەکاندا دەردەکەوێت، گونجاندن پرۆسەیەکی سەرەتاییی‌و پێویستە بۆ ئەوەی ئەو تصرفات‌و ڕوداوە یاساییانەی جێی ناکۆکین بخاتە ژێر ڕکێفی ئەو دەقە یاساییانەوە کە حوکمی ئەو تصرف‌و ڕوداوە دەکەن. هەڵەکردن لە گونجاندنی یاساییدا پرسێکی یاسایی یەو، هەمیشە لەژێر ڕکێفی چاودێری دادگای پێداچوونەوەدایە. گونجاندنی یاسایی وەك دەستنیشان کردنی نەخۆشیی وایە، ئەگەرچی پزیشك هەموو نەخۆشیەکان‌و، چارەسەرەکەشیان دەخوێنێ، بەڵام گرنگترین شت لە کاری پزیشکیدا دەستنیشان کردنی ڕاستەقینەی نەخۆشیەکەیە، ئیتر پاش ئەوە چارەسەر کردن ئاسانە، ئەگەر دەستنیشان کردنەکە هەڵە بوو، ئەوە کارەسات ڕودەدات، چونکە دەرمانی هەڵە دەدرێت بە نەخۆشەکە. بە هەمان شێوە یاساناس هەموو تاوانەکان‌و، سزاکانیشیان دەخوێنێ، بەڵام پەی بردن بە وەسفی ڕاستەقینەی تاوانەکەو دابەزاندنی سزاکەی بە شێوەیەکی دروست، کارێکی هزری یەو، پێویستی بە شارەزاییی‌و، لێزانین هەیە. گرنگیی کاری پزیشکی دادیی لێرەدا دەردەکەوێت کە چۆن یاریدەدەری دادوەرە لە کارئاسانی کردن بۆ گونجاندنی دروست، بۆ نموونە بۆ گونجاندن لە تاوانە سێکسیەکاندا بەم شێوە بەرچاو ڕوونی دەدات بە دادوەر، ئایا لاقەکردن ڕویداوە، یان کارێکی ئابڕو بردنە؟ ئەگەر زەوت کردن بووە، ئایا بە زۆرلێکردن بووە، یان بە ڕەزامەندی ؟ یان لە لێکۆڵینەوە لە کۆرپەیەکی مردوو، ئایا پێش لە دایکبوون مردووە یان دوای لە دایکبوون؟ چونکە حوکمی هەر یەکەیان جیاوازە. پزیشکی دادیی لەم ڕێگاوە خزمەتی دادپەروەریی دەکات. (٢).**

**لقی سێیەم: گونجاندن لە ڕوداوی مردندا:**

**یەکەم: گونجاندن لە کوشتنی بە ئەنقەستدا:**

پاش دڵنیابونی پزیشک لەمردنەکە، هۆکارەکەی دیاری دەکات، ئایا مردنەکە مردنێکی سروشتیە، یان لە ئەنجامی ڕوداوێك بووە، یان خۆکوژی بووە، یان بەکارێکی تاوانکاریی ئەنجامدراوە؟

یاسای ژمارە (١١١)ی سزادانی عێراقی ساڵی ١٩٦٩ز. پێناسەی کوشتنی بە ئەنقەستی نەکردوە، بەڵکو تەنیا سزاکەی دیاری کردوە. کە زیندانی هەمیشەیی، یان زیندانی کاتییە. بەڵکو فەقیهو یاساناسان پێناسەیان کردوە، لەو پێناسانەش:

١ – کوشتنی بەئەنقەست دەرهێنانی گیانی مرۆڤێکە بەئەنقەستو، بەناهەقو ناڕەوا لە لایەن مرۆڤێکی دیکەوە. (٣).

٢ – کوشتنی بەئەنقەست: کردن یان نەکردنی کارێکە لەلایەن مرۆڤێکەوە، بەمەبەستی کۆتایی هێنان بە ژیانی مرۆڤێکی دیکە بە ناڕەوا، ئەوەش ببێتە هۆی مردنی کەسەکە. (٤).

لە پێناسەکانەوە دەردەکەوێ ئەگەر مرۆڤ خۆی کوشت کردارەکە خۆکوژییە (إنتحار)، نەك کوشتن (قتل)، چونکە کوشتن دەبێت لە لایەن کەسێکی ترەوە ئەنجام بدرێتو، تاوان لێکراوەکەش لەکاتی دەستدرێژیەکەدا زیندو بێت. بەمەرج دانانی زیندوبونی مرۆڤەکە لە کاتی دەستدرێژیەکەدا پرسی تاوانکاریی ئاستەم (جریمە مستحیلە) دەوروژێنێ. تاوانی ئاستەمیش بەم شێوە پێناسە کراوە: ﴿بارو دۆخێکە تاوانکار ناتوانێت لەو دۆخەدا ئەنجامە تاوانکایەکە جێ بەجێ بکات﴾. (٥). وەك ئەوەی کەسەکە پێشتر مردبێتو، کەسێك بیداتە بەر فیشەك، بەمەرجێك بزانێت کەسەکە مردووە. یاسای سزادانی عێراقی ئەمە بە کوشتنی ئەنقەست دانانێت، بەڵکو بە دەستپێکردنی کوشتن (الشروع في القتل) دادەنێت. سزاکەشی جیاوازە لە سزای کوشتنی بە ئەنقەستو، سزاکەی لە ماددەی (٣١) ی یاسای سزادانی عێراقیدا دیاری کراوە.

ماددەی (٣٠)ی یاسای سزادانی عێراقی پێناسەی دەستپێکردنی تاوان بەم شێوە دەکات: ﴿بە دەستپێکردنی تاوان دادەنرێت، هەر کارێك بە مەبەستی ئەنجامدانی تاوانێك، یان کەتنێك دەستی پێ بکرێت‌و، ئەنجامدانەکەی ئاستەم بێت، لەبەر هەر هۆیەك پەیوەندیداربێت بە بابەتی تاوانەکەوە، یان بەو ئامرازەی لە ئەنجامدانیدا بەکار هاتووە. ئەگەر بیروبۆچونی بکەرەکە بۆ دروستبوونی ئەنجامەکە لەسەر وەهم‌و، نەزانینی تەواو بنیات نەنرا بێت﴾. (٦). ئەوە پزیشکی دادییە دەتوانێت ئەوە دیاری بکات ئایا کەسەکە پێشتر مردووە، یان بەو دەستدرێژیە مردووە، کارەکە کوشتنە یان خۆکوژییە، دادوەریش لەسەر ئەوە (تکییف) گونجاندنی یاسایی بۆ دەکات‌و، بە پێی ئەو گونجاندنەش سزای بۆ دیاری دەکات. ئەوکات سزای تاوانبارەکە سزای کوشتنی بەئەنقەستە، یان سزای دەستپێکردنی تاوانە. ئەمەش هۆکارێکی گرنگە بۆ پیادەکردنی دادپەروەریی. لە لایەکی ترەوە پزیشکیی دادیی دەتوانێت دەستنیشانی شێوازو هۆکارو ئامرازی بەکارهاتوو لە کوشتنەکەدا بکات، لەگەڵ سەلماندنی ئەوەی ئەو ئەنجامە لەو ڕەفتارەوە دروست بووە، ئەوەش دیاریکردنی (رکن) پایەی ماددیی کوشتنە بە ئەنقەستەکەیە، لەوانەشە کوشتنەکە بە خنکاندن، یان سوتاندن، یان ژێرئاوخستن، یان ژەهراویکردن، ...هتد ئەنجام درابێت. ئەوەش یارمەتی دادوەر دەدات لە دیاریکردنی ئەو ڕەفتارە تاوانکاریەدا کە تاوانکار پیادەی کردوەو هەروەها کارامەیی‌و لێزانی تاوانبار لە کردنی تاوانەکەدا. بۆ دیاریکردنی پایەی مەعنەوی تاوانەکەش ڕاپۆرتی پزیشکیی دادیی ڕۆڵی گرنگی هەیە، وەك زانینی جۆری چەکی بەکارهاتوو، هێزی پیاکێشان، شوێنی لێدان، وەك لێدانی سەری قوربانیەکە بە پیك. پزیشکیی دادیی ڕۆڵی گەورە دەبینێ لەم بوارەدا، چونکە قسەی یەکلاکەرەوە بۆ زانستەکانی پزیشکیی دادییە. لێرەدا ڕۆڵی ئەم زانستە لە ئاشکراکردنی پایەی ماددی‌و، مەعنەوی تاوانی کوشتنی بەئەنقەستدا بە ڕوونی دەردەکەوێت.

### دووەم: گونجاندن لە ڕوداوی ژەهراویکردندا:

لە خاڵی یەکەمی ماددەی (٤٠٦)ی یاسای سزادانی عێراقیدا دەڵێ: ﴿هەر کەسێك لەم دۆخانەدا بە ئەنقەست کەسێك بکوژێت سزا دەدرێت بە (إعدام) کوشتنەوە. لە بڕگەی (ب)ی ماددەکەدا دەڵێت: ئەگەر مردنەکە بە هۆی ماددەیەکی ژەهراوی یەوە بوو...﴾. (٧).

له دەقی یاساکەدا ئەوە دەردەکەوێت، بەکارهێنانی هەندێك ئامراز له کوشتندا لەبەر ترسناکیان سزاکەیان توندتره، کوشتنیش به ژەهر یەکێك لەوانەیه، بوونو نەبوونی ماددەی ژەهریش له جەستەی مردووەکەدا تاقیگه یەکلایی دەکاتەوه، لەبەر ئەوەی دادوەر ئامرازی ئاشکراکردنی هۆکاری مردنەکەی نییه، بۆیه دەبێت پشت به کەسی شارەزا ببەستێت، ئەویش پزیشکیی دادیی یه، ئەگەر ڕاپۆرتی پزیشکی دادیی سەلماندی هۆی مردنەکه ژەهراوی کردنه، ئەوکات دادوەر به پێی بڕگەی (ب)ی خاڵی یەکەمی ماددەی (٤٠٦)ی یاسای سزادانی عێراقی گونجاندنی یاسایی بۆ دەکاتو، سزای بۆ دیاری دەکات، که ئیعدامه. لێرەدا گرنگیی ڕۆڵی پزیشکیی دادیی له گونجاندنی یاسایی تاوانەکاندا دەردەکەوێت.

### سێیەم: گونجاندن له کوشتنی کۆرپەلەدا:

ماددەی (٤٠٧)ی سزادانی عێراقی دەڵێ: ﴿ئەو ژنەی مناڵه تازه له دایك بووەکەی دەکوژێت بۆ شاردنەوەی ئابڕوچونی ئەگەر به داوێنپیسی هەڵی گرتبێت، سزا دەدرێت به زیندانی کردن (سجن) بۆ ماوەیەك له ده ساڵ زیاتر نەبێت، یان به بەندکردن (حبس) بۆ ماوەی له ساڵێك کەمتر نەبێت.﴾. کوشتنی مناڵ به دوو ڕێگا دەبێت: به بەکارهێنانی ئامرازێك، یان وازلێهێنانی تا دەمرێت. پزیشکی دادیی ئەو کەسەیه دەتوانێت هۆکاری ڕاستەقینەی مردنەکه دیاری بکات. دەتوانێت ئەوەش دیاری بکات، ئایا مناڵەکه به زیندوویی له دایك بووه، یان به مردوویی. دیاریکردنی ئەوەش گرنگه چونکه بۆ هەر بارێکیان حوکمەکه دەگۆڕێت. ئەگەر به زیندوویی له دایك بوو بوو، دادوەر گونجاندنی یاسایی کوشتنی کۆرپەلەی تازه لەدایکبوی بۆ دەکات. لێرەدا ماددەی (٤٠٧)ی یاسای سزادانی عێراقی پیاده دەکات. بەڵام ئەگەر کۆرپەکه به مردوویی له دایك بوو بوو، ئەوه خاڵی یەکەمی ماددەی (٤١٧)ی یاسای سزادانی عێراقی پیاده دەکات، که ئەمه دەقەکەیەتی: ﴿هەر ژنێك به هەر ئامرازێك (سکەکەی) له بار برد، یان به ڕەزامەندی خۆی ڕێگای دا کەسێکی دیکه سکەکەی له بار بەرێت، سزا دەدرێت به بەند کردن بۆ ماوەیەك له ساڵێك زیاتر نەبێتو، غەرامەکردنی له (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت، یان به یەکێك لەو دوو سزایه﴾. (٨).

## لقی چوارەم: گونجاندن له تاوانی سێکسی دا:

یاسای سزادانی عێراقی له ماددەی (٣٩٣)دا تاوانی ئابڕوبردنی دیاری کردوە، له توخمەکانی ئابڕوبردن لاقەکردنە. که لەوانەیە بەرامبەر ناکامێك، یان پێگەشتویەك، یان بەبێ توندوتیژی بەرامبەر ناکامێك بکرێت، لەو جۆرە تاوانانەدا داوا له پزیشکی دادیی دەکرێت پشکنین بۆ قوربانیەکە بکات، بۆ زانینی ڕودانی دەستدرێژیو تاوانەکە. له تاوانی زەوتکردندا (إغتصاب) دڕاندنی پەردەی کچێتیو، بوونی خوێن لێهاتن له نیشانە سەرەکیەکانە که یارمەتیدەری دیاریکردنی زەوتکردنەکەیە، بەڵام مەرج نییە هەمووجار پەردەی کچێتی بدڕێت، بەڵکو بوونی شلەی سپێرم له ناو لەشدا، یان لەسەر پۆشاكو جەستەی قوربانیەکە بەڵگەن لەسەر ڕودانی کارەکە، پزیشکیی دادیی بۆ ئەو نیشانە گشتیانە دەگەڕێت که له ئەنجامی بەرگریدا ڕودەدات. بوونی نیشانەکانی وەك کوترانو ڕوشان، بەڵگەی ناڕازیبونی قوربانیەکەیە. له پاشبازیشدا چەند نیشانەیەك هەن بەڵگەن لەسەر ڕودانی کارەکە. پشکنینی پزیشکیی دادییو، دۆزینەوەی ئەو نیشانانە له قوربانیەکەدا بە بەڵگەی زانستی یارمەتیدەری سەلماندنی پایەی ماددیی تاوانەکە دەبێت. لەوانەشە داوا بکرێت له پزیشکیی دادیی بوونو نەبوونی سکپڕی دیاری بکات، که بوونەکەی بەڵگەیە لەسەر ڕودانی کاری سێکسی، مەرجیش نییە پەردەی کچێتی دڕابێت، یان جوتبوون ڕویدابێت، بەڵکو لەوانەیە له کاتی لێخشاندا سپێرم ڕژابێتە ناو لەشی کچەکە.

## لقی پێنجەم: گونجاندن له بریندارکردندا:-

له زاراوەدا برین هەموو جیابونەوەیەکی شانەکانە، که له ئەنجامی توندوتیژی، یان پیاکێشان ڕودەدات. بەڵام له لایەنی یاساییەوە ڕوشانو پیاکێشانو سوتانو شکانی ئێسك بە برین دادەنرێن. لەوەی پێشەوە دەردەکەوێت بەگوێرەی ئامێری بەکارهاتوو برینەکانیش جیاوازن، بە هەمان شێوە بە پێی جیاوازیی برینەکانیش یاسا سزای جیاواز دەسەپێنێ بەسەر ئەنجامدەرەکەیدا، دیاریکردنی برینەکەو، دیاریکردنی ڕێژەی پەککەوتنی قوربانیەکە له لایەن پزیشکیی دادییەوە ڕاستەوخۆ کاریگەر دەبێت لەسەر گونجاندنی

یاسایی‌و جۆری خراپەکاریەکە، ئایا سەرپێچییە، یان کەتنە، یان تاوانە، بەو دابەشکردنە گشتییە کە لە ماددەی(٢٣)ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا هاتووە: ﴿تاوانەکان بەپێی گەورەییان دەکرێن بە سێ بەشەوە: (تاوان، کەتن، سەرپێچی). جۆری تاوانەکە بە جۆری قورسترین سزا کە یاسا بڕیاریداوە دیاری دەکرێت. ئەگەر لە سزای تاوانێکدا بەندکردن‌و غەرامە کۆ بوونەوە، جۆری تاوانەکە بە هێندەی ئەندازەی بەندکردنی بڕیار لەسەردراو لە یاسادا دیاری دەکرێت﴾. لە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٤١٢)ی سزادانی عێراقیدا دەڵێ: ﴿هەرکەس بەئەنقەست دەستدرێژی کردە سەر کەسێکی تر بە مەبەستی دروستکردنی ناساغیەکی بەردەوام بە بریندارکردن، یان بە لێدان، یان بە توندوتیژی، یان بە پێدانی ماددەیەکی زیانبەخش، یان کردنی هەر کارێك پێچەوانەی یاسا بێت، سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەیەك لە پانزە ساڵ زیاتر نەبێت. ناساغیی بەردەوام (عاهە مستدیمە) دێتە دی ئەگەر ئەمانە ڕوویاندا: بڕین، یان لێبوونەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لاشە، یان بڕینەوەی پارچەیەك لە لاشە، نەمان یان کەمکردنەوەی سودەکەی، یان شێتبوون، یان پەککەوتنی هەمیشەیی یەکێك لە هەستەکان بە شێوەیەکی گشتی یان لاوەکیی، یان تێکچوونی لاشە، یان دروستکردنی ترس لەسەر ژیان﴾. بۆ سەلماندنی بوونی ناساغی‌و، دیاریکردنی پەککەوتنی گشتی‌و لاوەکیی هەمیشەیی دەگەڕێینەوە بۆ ئەندازەی ئەو کەموکوڕیەی کە لە نەتوانینی ئەنجامدانی ئەرکدا بۆی دروست بووە، ئەوە پزیشکیی دادییە دیاری دەکات پەککەوتنەکە کاتییە، یان هەمیشەییە، لاوەکیە یان سەرەکیە. دادوەریش پشت بەو ڕاپۆرتە دەبەستێت‌و، بە پێی ئەوە گونجاندنی بۆ دەکات. هەر کەس برینێکی کردە کەسێکی دیکەو بۆ ماوەیەکی کاتیی پەکی خست لە (٢٠) ڕۆژ زیاتر بێت، ئەوە بە پێی بڕگە (ب)ی خاڵی دووی ماددەی (٤١٣)ی یاسای سزادانی عێراقی سزای کەتنی بۆ دادەنرێت. دیاریکردنی ئەوەش لە لایەن لیژنەیەکی پزیشکیی دادییەوە دەبێت، (٩). ئەمەش ڕۆڵی پزیشکیی دادیی دەردەخات لە گونجاندنی یاساییدا.

## لقی شەشەم: گونجاندنی یاسایی له دیاریکردنی تەمەندا:-

### یەکەم: بۆ دیاریکردنی بەرپرسیارێتی سزایی:

دیاریکردنی تەمەن گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ دادوەر، بە تایبەت (بۆ دیاریکردنی بەرپرسیاێتی سزایی، بۆ هاوسەریی، بۆ دایەنیکردنی منالّ، بۆ سەلماندنی (البنوه) ڕۆلایەتی. کاتێك کەسێك تاوانێك ئەنجام دەدات، ئەگەر سەلێنرا تەمەنی تاوانبارەکە لە (١٨) سالّ کەمترە، دادوەر هەوالّەی دادگای نەوجەوانانی دەکات. بە پێی یاسای ژمارە (١٤)ی پەرلەمانی کوردستانی سالّی ٢٠٠١ کە لە ژمارە (٢١)ی وەقایعی کوردستاندا لە ٢٠٠١/١٠/٣١ بلاو کراوەتەوە، تەمەنی بەرپرسیارێتی تاوانکاریی دیاری کراوە بە (١١) سالّ. لە کاتێکدا لە ماددەی (٦٤)ی یاسای سزاکانی عێراقی ژمارە (١١١)ی سالّی ١٩٦٩ بە تەواو کردنی (٩) سالّ دیاریکراوە، واتە: لەوێش بە پێی یاسای چاودێری نەوجەوانانی ژمارە (٧٦)ی سالّی ١٩٨٣ی هەموار کراو ڕێوشوێنی پێویست بەرامبەر نەوجوانەکە دەگیرێتەبەر، لێرەدا لە ڕێی پزیشکی دادییەوە هەم مافی تاکەکان دەپارێزرێ‌و، هەم دادپەروەریی پیادە دەکرێ. لەوانەیە بۆ خۆ قوتارکردن تاوانبار خۆی بە بچوك لەقەڵەم بدات. یان سکالاکارو قوربانی تاوانبارەکە بە گەورەتر لە تەمەنی خۆی لە قەڵەم بدەن. ماددەی (٤)ی یاسای نەوجەوانانی ژماه (٧٦)ی سالّی ١٩٨٣ی هەموار کراو بۆ سەلماندنی تەمەن دەلّێ: ﴿ بۆ سەلماندنی تەمەنی نەوجەوان دەبێت بە بەلگەی فەرمی بێت، ئەگەر هاتوو ئەمە نەبوو یاخود ئەو تەمەنەی تیا نوسراوە لە بەژن‌و بالای نەگونجاوبوو، پێویستە دادگا هەوالّەی لیژنەی پشکنینی پزیشکی بکات بۆ هەڵسەنگاندن‌و خەملاندنی تەمەنی بە هۆکارە زانستیەکان﴾. یەکلا کردنەوەی ئەو کەیسەش تەنیا لە لایەن پزیشکیی دادییەوە دەبێت.

### دووەم: لە هاوسەرێتی دا:

بە پێی خالّی (٣)ی ماددەی (٤٠)ی یاسای باری کەسێتی، ژن‌ومێرد بۆیان هەیە داوای جیابوونەوەی دادوەریی بکەن، ئەگەر گرێبەستی هاوسەرگیریی بەبێ ڕەزامەندی دادوەرو، پێش تەواوکردنی هەژدە سالّی کرابێت. (١٠). ئەمە مافێکە یاسا بۆ هەردووکیانی

دەستەبەر کردووە، پاراستنی ئەو مافەش لە ڕێی پزیشکی دادییەوە دەبێت، کاتێك تەمەنی سکاڵاکار یان سکاڵا لێکراوەکە دیاری دەکات و، دادوەریش لە سەر ئەو دیاریکردنە بڕیار دەدات.

## سێیەم: دان نان بە ڕەچەڵەك و ڕۆڵایەتیدا (النسب والبنوة):

بە پێی خاڵی یەکی ماددەی (٥١)ی یاسای باری کەسێتی کەسێك بۆی هەیە -ئەگەر لە نەخۆشی مردنیشدا بێت- ددان بنێ بەوەدا کەسێکی ڕەچەڵەك نادیار ڕۆڵەیەتی، ئەگەر بکرێت تەمەنی بە تەمەنی ڕۆڵەی ئەو بشێت. (١١). خۆ ئەگەر کەسێك لاف ئەوەی لێدا منالی کەسێکە، بەلام تەمەنی ڕێگای ئەوەی نەئەدا منالی ئەو کەسە بێت، ئەوە دادگا داواکەی پەرچ دەداتەوە. ئەوە پزیشکی دادیی دەتوانێت ئەو جیاوازی تەمەنە دیاری بکات و، مافی تاکەکان بپارێزێت. چونکە لەوانەیە کەسێك خۆی بکات بە منالی کەسێکی دەولەمەند بە مەبەستی خواردنی سامانەکەی، یان باوکێك -لەبەر هەر هۆیەك- بیەوێ کەسێك بەشدار بکات لە سامانەکەیدا.

## تەوەری دووەم: رۆڵی پزیشکیی دادیی لە بەڵگە هێنانەوەدا :

### لقی یەکەم: بەڵگەی یاسایی چی یە ؟ ( ١٢ ).

١ - **بەڵگە لە زاراوەی یاسادا:** هەموو ئامرازێکی دروستو مۆڵەت پێدراوە، بوونو نەبوونی ڕوداوێکی پێ بسەلمێنرێ، یان ڕاستییو ناڕاستیی کارێکی پێبسەلمێنرێ.

٢ – **بەڵگە:** ئەو ئامرازەیە بۆ گەیشتن بە ڕاستیی پێویست دادوەر پشتی پێدەبەستێت، لێرەدا مەبەست لە ڕاستیی هەموو ئەوانەیە پەیوەندیان بە ڕوداوی بەر باس هەیە، تا حوکمی یاسای لەسەر جێبەجێ بکرێت.

٣ – **چەمکی بەڵگە لە باسو لێکۆڵینەوەی سزاییدا** بریتی یە لە: هەموو ئەو شتانەی بوونو نەبوونی پرسێکی دیاریکراوی کەیسێك دەسەلمێنێ، یان هەموو ئەوانەیە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە تاوانبار کردن یان بێتاوانی تۆمەتبارەوە هەیە.

٤ – **بەڵگە** سەلماندنێکە لەسەر ژیرییو لۆژیكو، لە چوارچێوەی شەرعیەتدا بێت بۆ سەلماندنی دروستیی گریمانەیەك، یان بەرزکردنەوەی پلەی یەقینە لە قەناعەت کردندا لەو ڕوداوەی جێی ناکۆکیە.

### لقی دووەم: جۆری بەڵگەکانی تاوان: ( ١٣ ).

لەسەر پۆلێنکردنی بەڵگەکان زاناو فەقیهەکان فرە ڕاو بۆچونن، تا لە پرۆسەی دۆزینەوەی تاوانو، سەلماندنی تاوانکارییو دادوەریدا سودی لێ وەربگیرێ، هەندێك لە شارەزایان بە پێی فەرمانەکەی بەڵگە پۆلێن دەکەنو، هەندێکیش بە پێی سەرچاوەکەی.

**یەکەم:** پۆلێنکردنی بەڵگە بە پێی فەرمانەکەی دەبێت بە سێ بەشەوە:

١ -**بەڵگەی تۆمەتبارکردن:** ئەو بەڵگەیە ئەگەر دەست لێکۆڵەر کەوت تۆمەتبار دەداتە دادگا، یان داوای لەسەر بەرز دەکاتەوە.

**٢-بەڵگەی تاوانبار کردن:** ئەو بەڵگەیە هەرکات هەبوو، دڵنیایی تەواو دەبەخشێت بە تاوانبار کردن.

**٣-بەڵگەی نکوڵی کردن (نفی):** ئەو بەڵگەیە بێتاوانیی تۆمەتبار دەسەلمێنێ.

**دووەم: پۆلێنکردنی بەڵگەکان بە پێی سەرچاوەکەی:**

١ - **بەڵگەی یاسایی:** ئەو کۆمەڵە بەڵگانەیە یاسادانەر دیاریان دەکات‌و، هێزی هەر یەکێکیانی دیاری کردوەو، سەلماندن بەبێ ئەوە نابێت. دادوەریش ناتوانێت هێزی زیاتری پێبدات.

٢ - **بەڵگەی زارەکیی:** ئەو بەڵگەیە لە کەسایەتیەکەوە دەردەچێت، خۆی لە قسەی کەسانی تردا دەبینێتەوەو، ناڕاستەوخۆ کار لە قەناعەتی دادوەر دەکات.

٣ - **بەڵگەی شارەزایی (هونەریی):** ئەو بەڵگە ماددیو مەعنەویەی ناو داوایە کە شارەزا دەیخەملێنێ‌و، دادگا خۆی بە تەنیا ناتوانێت لە بارەیەوە بگات بە ئەنجامێکی یەکلا کەرەوە.

٤ - **بەڵگەی ماددی:** ئەو بەڵگەیە لە ڕەگەزی ماددیەوە دروست دەبێت‌و، ڕاستەوخۆ کار لە قەناعەتی دادوەر دەکات. بەڵگەی ماددی دیارترین‌و، گرنگترین بەڵگەی تاوانکاری یە.

**لقی سێیەم: گرنگیی بەڵگەی ماددیی لە دادوەریدا:**

لە بابەتە سزایەکاندا بەڵگە ئەوپەڕی گرنگیی هەیە، چونکە تاوانبارکردن‌و، بێتاوانکردن لەسەر بوون‌و نەبوونی بەڵگە وەستاوە، کۆکردنەوەو، تاوتوێکردنی بەڵگەش لە تایبەتمەندی پۆلیسی دادوەریی‌و، لایەنەکانی لێکۆڵینەوەی دادوەرییە. زانایان بە گشتی لەسەر ئەوە کۆکن کە بەڵگە بە نسبەتی مافەوە وەك ڕۆح وایە بۆ جەستەو، بە بوونی بەڵگەوە ماف بەهای زانستیی هەیە، بەڵگە سەرچاوەی ڕەهای قەناعەتی دادوەری تاوانکاریەو، بە دەروازەی ناسینی ڕاستیی دێتە ئەژمار، سەرەڕای ئەوەش بەڵگەی ماددی لە

بواری ئاشکراکردنی تاواندا گرنگیەکی تایبەتی هەیە. ئەو گرنگیەش لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

١ – گرنگیی بەڵگەی ماددی لە سەلماندنی ڕوودانی تاواندا:

لەم شوێنەدا بەڵگەی ماددی توخمی سەرەکی سەلماندنی پایەی ماددی تاوانە، بۆ نموونە بوونی ژەهری زەرنیخ لەسەر لاشەی قوربانیی بەڵگەیە لەسەر مردنی بە ژەهرەکە.

٢ – گرنگیی بەڵگەی ماددی لە دیاریکردنی کەسایەتی تۆمەتباردا:

پزیشکی دادیی ڕۆڵی سەرەکیی هەیە لە دیاریکردنی کەسایەتی تاوانکاردا، بۆ نموونە پەنجەمۆر بەڵگەیە لەسەر کەسایەتی تاوانکار.

٣ – گرنگیی بەڵگەی ماددی لە سەلماندنی تۆمەتەکە لەسەر تاوانکار:

زۆر جار لە میانەی کۆمەڵێك بەڵگەی ماددیەوە دەگەینە ئەوەی ئەو تۆمەتبارەی کەسایەتیەکەی دیاریکراوە بەو تاوانە هەڵساوە. وەك بوونی پەڵەی خوێن لەسەر پۆشاكو، بوونی شوێنی بەرگریی.

٤ – گرنگیی بەڵگەی ماددی لە ناچارکردنی تۆمەتبار لەسەر دان پیانان:

پێلێنان کۆنترین ڕێگاکانی سەلماندنە، وتراوە دانپێدانان گەورەی بەڵگەکانە. زۆر جار تاوانباران خۆیان لەوە دەبوێرن دان بنێن بە تاوانەکانیاندا، بۆیە شێوازی زانستی و بەڵگەی ماددی باشترین شێوازە بۆ ناچارکردنیان تا پێ لە تاوانەکانیان بنێن.

٥ – گرنگیی بەڵگەی ماددی لە نرخاندنی شایەتیداندا:

بەڵگەی ماددی فەرمانێکی سەرەکی و گرنگی هەیە لە ڕاستکردنەوەی وتەی شایەتدا. گرنگیی بەڵگەی ماددی لەوەدایە وتەی شایەت دووپات دەکاتەوە، یان بە درۆی دەخاتەوە. (١٤).

## لقی چوارەم: بەڵگەی پزیشکیی دادیی لە لێکۆڵینەوەی پۆلیسدا:

لەم قۆناغەدا بەڵگەی پزیشکیی دادیی زۆر گرنگە، چونکە هەڵگرتنەوەی بەڵگە لەم سەرەتادا گرنگیەکەی لەوەدایە، هەندێك بەڵگەی پزیشکیی دادیی کاتی یەو، لەوانەیە بە تێپەڕبونی کات لەناو بچێت، یان بگۆڕێت. وەك (وەرگرتنی سەمپڵی سپێرم لەسەر جلوبەرگ، یان لەسەر لاشەی قوربانیەکە، یان لە کاتی هەڵگرتنی تەرمەکەدا هەندێك شوێنەواری تاوانەکە لەناو بچێت). بەڵگەی پزیشکیی دادیی یارمەتیدەرە بۆ سەلماندنی ڕودانی تاوانەکەو، ئەو دۆخەی تاوانەکە تێیدا ڕویداوە.

لە هەندێك دۆخدا شوناسی قوربانیەکەش دیاری دەکاتو، ئەوەش دەسەلمێنێ بکەری تاوانەکە کەسێکی دیاریکراوە، یان ئەو کەسە نییە کە تۆمەتەکەی دراوەتە پاڵ. لێکۆڵینەوەی سەرەتایی ئەو کاتە دەست پێ دەکات سکاڵاو ئاگاداریی دەگاتە ئەفسەری پۆلیس کە تاوانێك ڕویداوە، بە پێی بڕگەی (ئەلف) لە ماددەی (٤٩)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائيه، ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٧١ز، "بەرپرس لە بنکەی پۆلیس لەسەریەتی کاتێك هەواڵی پێدرا تاوانێك، یان کەتنێك ڕویداوە، خێرا وتەی هەواڵدەرەکە وەربگرێتو، واژۆی پێ بکاتو، ڕاپۆرتێك لەو بارەوە بنێرێ بۆ دادوەری لێکۆڵینەوە، یان بۆ لێکۆڵەر. بە پێی بڕگەی (أ)ی ماددەی (٦٩)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائيه "دادوەر یان لێکۆڵەر بۆی هەیە لە خۆیەوە، یان لەسەر داوای لایەنی داوا (ڕکابەرەکان) شارەزایەك یان زیاتر دیاری بکات، تا ڕای خۆی لەسەر ئەو تاوانە دەربڕێت کە لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێت". واتە دادوەر یان لێکۆڵەر بۆیان هەیە پەنا ببەنە بەر بەڵگەکانی پزیشکیی دادیی. بە پێی بڕگەی (و) لە ماددەی (٥)ی یاسای پزیشکیی دادیی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣ز. پزیشکی دادییش بۆی هەیە لە کاتی پێویستدا بۆ بینینو ئاشکراکردنی لایەنەکانی تاوانەکە، ئامادەی شانۆی تاوان ببێت. یاسادانەری عێراقی کارێکی زۆر باشی کردووە، بۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی دروستو، بۆ دڵنیابوونی لایەنە ڕکابەرەکانو، بۆ نەفەوتانی بەڵگەکان، ڕێگای داوە بە لێکۆڵەرو، ئەفسەری لێکۆڵینەوەو، لایەنە ڕکابەرەکان داوا بکەن پزیشکی دادیی ئامادەی شانۆی تاوانەکە ببێت، لە هەمان کاتدا ڕێگای داوە پزیشکی دادیی بۆ خۆی ئامادەی شانۆی

تاوانەکە ببێت. ئەمەش گرەنتیەکی زیاترە بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکانو، پاراستنی مافی لایەنەکانو، دابینکردنی دادپەروەری.

## لقی پێنجەم: بەڵگەی پزیشکیی دادیی لە قۆناغی لێکۆڵینەوەی دادوەریدا:

لایەنی لێکۆڵینەوەی دادوەریی سود لە هەموو ئەو بەڵگانە وەردەگرێت کە لە ئاستی لێکۆڵینەوەی پۆلیسدا کۆ دەکرێتەوە، لە گەڵ ئەو بەڵگانەیش خودی لێکۆڵەر دەستی دەکەوێت. دیارە دادوەر دەگەڕێت بە شوێن بەڵگەکانی تاوانبارکردنو بێ تاوانیدا. شایانی ئەوەیە لێرەدا ڕۆڵی بەڵگەی پزیشکیی دادیی لە هاوبەڵگەی بێتاوانیدا (قرينة البراءة) بخەینە ڕوو بۆ ئەو کەسانەی کە گومان دەکرێ هەڵسابن بەو تاوانە، یان پێی تۆمەتبار کراون. لەم قۆناغەدا بەڵگەی پزیشکیی دادیی پابەندی پرەنسیپی ڕوو بەڕوو بوونەوە دەبێتەوەو، دەخرێتە بەردەم لایەنەکان. هەروەها ئەم بەڵگە پابەندی ئازادیی سەلماندنیش دەبێت. یاسادانەری عێراقی لە ماددەی (٢١٣)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائيەدا تیشکی خستووەتە سەرو، بە پێی ماددەی ناوبراو دادوەر پابەند نابێت بە ئامرازی سەلماندنەوە. سەرەڕای ئەوانەش خەملاندنی هێزی بەڵگەکان لەم قۆناغەو، لە قۆناغی دادگایی کردنیشدا بە جێهێڵراوە بۆ قەناعەتی دادوەر. ئەمەش دەقی بڕگەی (أ)ی ماددەی (٢١٣)ی یاسای أصول المحاكمات الجزائيە یە: «دادگا لە داوادا لەسەر قەناعەتی خۆی حوکم دەدات، لە ڕوانگەی بەڵگە پێشکەش کراوەکان لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوە، یان دادگایی کردندا بێت. ئەو بەڵگانەش دانپیانانو، گەواهی شایەتو، کۆنوسی لێکۆڵینەوەو، کۆنوسو زانیارییە فەرمیەکانی دیکەو، ڕاپۆرتی شارەزایانو هونەریەکانو، گرینەکانو، بەڵگەکانی تر کە یاسا ددانی پێدا ناون». بەمەش بەڵگەی پزیشکیی دادییو، هەموو بەڵگەکانی تری وەك شایەتیدانو، دانپیانان.... لە هێزدا یەکسان کراون. جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین، پێویستە هێزی سەلماندنی بەڵگە زانستیەکان بەهێزتر بکرێن، چونکە بەڵگەی زانستیی وردترو، بابەتیانە ترە. لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی کاتێك حەقیقەتە زانستیەکان دەخرێنە بەردەم دادوەر لەوانەیە قەناعەتی بگۆڕێت بەوەی ئەنجامە زانستیەکان جێی گومان نین، لەوانەیە ئەوەش بە نێگەتیڤی بشکێتەوە بەسەر ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوەی دادوەریدا، ئەگەر ددان بەوەدا بنێین بەڵگەی زانستیش دەکرێت

ساختەکاریی یان هەڵەی تێدا بکرێت، یان ئەنجامەکە ڕێژەیی بێت‌و، پڕاوپڕ بەو شێوە نەبێت. دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین ئەگەر هەڵسەنگاندنی دادوەر پابەند بکەین بە بەڵگەی زانستیەوە ئەوە (شارەزایان) دەسەڵاتی ڕاستەقینەی دادوەریان پێ دەدرێت. لە هەمان کاتدا ئەگەر دادوەری لێکۆڵینەوە بەڵگەی زانستی پشتگوێ بخات بێگومان کاریگەریی لەسەر ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە دەبێت، چونکە لێکۆڵینەوەکە لە شەرعیێتێك بێبەش دەکرێت هێز لە زانستەوە وەردەگرێت. سەرەڕای ئەوانەش دەسەڵاتی خەمڵاندنی دادوەر بۆ بەهای بەڵگەی پزیشکیی دادیی بەبێ تاوتوێ کردن، کۆمەڵێك گرفتی زانستیی دروست دەکات، چونکە دادوەر لەو بوارەدا زانیاری تەواوی نییە. جێی سەرنجە لە گۆڕەپانی پراکتیکیدا بەڵگەی پزیشکیی دادیی هەمیشە ڕووبەرێکی فراوانی بیرکردنەوەی دادوەری داگیرکردووەو، زۆر جار قەناعەتی دادوەر لەسەر ئەو بەڵگانە دادەمەزرێ. — بە بەردەوامی بەڵگە زانستیەکان هێزی زیاتریان پێدەدرێت‌و، لە دادوەریدا وەك بەڵگەی یەکلاکەرەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

### لقی شەشەم: بەڵگەی پزیشکیی دادیی لە قۆناغی دادگایی کردندا:

لە میانەی لێکۆڵینەوەی کۆتاییدا بەڵگەی پزیشکیی دادیی وەك بەڵگەکانی تر دەخرێتە ڕوو، بۆ ئەوەی لایەنی دادگا بیخەملێنێت. وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا بەڵگەی پزیشکیی دادییش پابەندە بۆ پرەنسیپی گرینەی بێتاوانی (قرينة البراءة)، واتە: (سەلماندن لەسەر لایەنی تۆمەتبارکەرە)و، دادوەریش ئازادە لە قەناعەتی تایبەتی خۆیدا. وەك ڕێسایەکی گشتی دادوەری دادگای تاوانەکان پابەندە بەو بەڵگانەوە کە بە شێوەیەکی ڕووبەڕوو لە دانیشتنەکەدا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ. ماددەی (٢١٢) یاسای أصول المحاكمات الجزائية دەڵێ: ﴿دادگا بۆی نییە لە بڕیارداندا پشت بە بەڵگەیەك ببەستێت نەخرابێتە گفتوگۆو، لە دانیشتنەکەدا ئاماژەی پێنەکرابێت. پشت بە پەڕاوێکیش نابەستێت لایەنێك پێشکەشی کردبێت‌و، لایەنەکانی دیکە ئاگاداری نەبن. دادوەر بۆی نییە بە زانیاری کەسیی خۆی لە داوایەکدا بڕیار بدات﴾. بە پێی خەملاندنی دادوەر بۆ هەر بەڵگەیەك —لە نێوانیشیاندا بەڵگەی پزیشکیی دادیی_ ئازادە لە سەلماندندا. دادوەر لەسەری نییە پابەند بێت بە بەڵگەیەکی زانستیی دیاری کراوەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە بە ئارەزوی خۆی بڕیار بدات، بەڵکو بە پراکتیکی لە دادوەریدا بەڵگەی پزیشکی دادیی لە هەندێك کاتدا

یەکلا کەرەوەیە، وەك تاوانە ڕەوشتیەکانو، خەملاندنی تەمەنو، بەڵگەی مۆری بۆماوەیی (D.N.A). لە بەشی سێیەمی ئەم باسەدا بەهای یاسایی ڕاپۆرتی پزیشکیو، هەوڵە یاسایەکان بۆ سەلماندن بە مۆری بۆماوەیی تاوتوێ کرا.

## سەرچاوە:

١ – فرقد عبود العارضي؛ التكييف، ص١٨١-١٨٢. (www. Uobablyon . Edu . iq).

٢ – محمد نبيه؛ أصول التكييف في المواد الجنائية. ( www. Mohamoon – montada . com).

٣ – د.ماهر عبد شويش الدرة، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، بدون سنة

٤ – د. ماهر عبد شويش الدرة؛ ص ١٣٠.

٥ – د. ماهر عبد شويش الدرة؛ ١٣٠.

٦ – اعداد القاضي سردار عزيز خۆشناو، قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩، مطبعة منارة، أربيل، سنة ٢٠١٠، ص١٦.

٧ – القاضي سردار عزيز خۆشناو ص١١٤-١١٥.

٨ – القاضي سردار عزيز خۆشنا؛ ص١١٩.

٩ – تعليمات اللجان الطبية رقم (١) لسنة ١٩٩٥م، نشرت في الوقائع العراقية، عدد، (٣٥٥٠)، ١٩٩٥/٢/١٧.

١٠ – إعداد الحاكم /عوني كمال سعيد البزاز، أحكام ومواد القوانين والقرارات المتعلقة بالأحوال الشخصية النافذة في أقليم كوردستان، أربيل، سنة٢٠١٠م، ص٤١.

١١ – المصدر نفسه، ص٥٠.

١٢ – د. منصور عمر المعايطة؛ الطب الشرعي في خدمة الأمن والقضاء، سابقا، ص٣١-٣٢. و د. صفاء عادل سامي؛ حجية الصمة الوراثية في الإثبات الجنائي، سابقاً، ص٢٠.

١٣ – د. منصور عمر المعايطة ص٣٦-٤٠.

١٤ – د. منصور عمر المعايطة.؛ ص٤٧-٤٩.

## كۆتایی:

له كۆتاییدا گەشتینه ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١ – پزیشكیی دادیی پایەیەكی گرنگی پاراستنی ئاسایش‌و ماف‌و دادپەروەری‌و، پێوەرێكی كۆمەڵایەتیه بۆ زانینی ئاست‌و جۆری كێشه كۆمەڵایەتیەكان.

٢ – بایەخی شیاو نەدراوه به پلەو پایەی پزیشكی دادیی‌و، ئەو رۆڵەی له پاراستنی ئاسایش‌و دادپەروەری دا دەیگێرێت.

٣ – پێویستیی شارەزایانی بواری پزیشكی دادیی به شیاندن‌و، پێگەیاندن‌و، خولی تایبەت‌و، بایەخ پێدانی زیاتر.

٤ – پێویستیی پەیمانگه پزیشكییه دادییەكان به شوێنێك له لایەنی جوگرافی‌و، فراوانیەوه گونجاو بێت لەگەڵ ئەرك‌و كاری ئەو دەزگایەدا.

٥ – نەبوونی یاسایەكی شیاو بۆ پزیشكی دادیی، هاوتای پێشكەوتنه زانستیەكانی پزیشكی دادیی بێت .

٦ – لەگەڵ پەرەسەندنی تاوان‌و، بەكارهێنانی تەكنەلۆژیای نوێ له تاوانكاری‌و دەرخستنی تاواندا، یاسای تاوانەكان وەك خۆی ماوەتەوە..

## پێشنیار:

١ – گرنگی پێدانی تایبەت به پزیشكی دادیی‌و، كردنەوەی خولی ڕاهێنانی پسپۆڕیی بۆ كادیرەكانی ئەو دەزگایەو ڕەوانەكردنیان بۆ دەرەوەی وڵات‌و پێگەیاندنی پزیشكی دادیی زیاتر.

٢ – كردنەوەی بینای نوێ بۆ پەیمانگا پزیشكیەكان، به شێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ كاروباری پەیمانگادا.

٣ – لیژنه پزیشکیەکان له بینای پەیمانگای پزیشکی دادیی دانیشن‌و، له ژێر سەرپەرشتی پەیمانگەدا کار بکەن، چونکه لیژنه پزیشکیەکان بەشێکن له پزیشکی دادیی.

٤ – له هەر پەیمانگایەکی پزیشکی دادییدا بنکەیەکی پۆلیس هەبێت بۆ ئاسانکردنی کارەکان‌و، پاراستنی پەیمانگاو کادیرەکان لەو کەسانەی هەوڵی دەستدرێژی کردن دەدەن بۆسەر کادیرو موڵکی پەیمانگا.

٥ – کردنەوەی بەشی ترشی ناوکی (D.N.A) له هەرێمداو، حکومەت ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی بکات‌و، نوێترین ئامێری زانستی بۆ دابین بکات‌و، پزیشکی پسپۆڕو کادیری بایۆلۆژی‌و، بۆماوەزانی بەڕێوەی ببەن‌و، ئیتر پشت به تاقیگە ئەهلیەکان نەبەسترێ.

٦ – داڕشتنی یاسایەکی تایبەت به چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ (D.N.A)و، گرنگی پێدانی له لێکۆڵینەوەو سەلماندنی تاوانکاریدا.

٧ – کردنەوەی خولی شیاندن بۆ لێکۆڵەرو گرنگی پێدانیان‌و فراوانکردنی زانیاریان لەسەر چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ کێشه پزیشکیە دادیەکان‌و، پاراستنی جەستەو برینەکان‌و بەڵگەکان‌و، چۆنیەتی ناردنی تەرم‌و پارچەو سامپڵ بۆ پزیشکی دادیی، تا به شێوەی ڕاست‌و دروست بگەیەنرێنه شوێنی (توێکاریی) ئەگەر مردوو بوو، یاخود شوێنی (پشکنین) ئەگەر زیندوو بوو، نەتوانرێت دەستکاری بکرێت.

## سەرچاوەكان:-

١ – القاموس المحيط، محمد بن يعقوب الفيروزنابادى، نشر دار نوبليس، لبنان ،طبعة أولى، ٢٠٠٦م.

٢ – مفردات الفاظ القرآن الكريم، الراغب الاصفهانى، ناشر مكتبة المرتضوية، مطبعة خورشيد، طهران، طبعة ثانية، ١٣٦٢هـ.ش

٣ – الوجيز في الطب العدلي، د. وصفي محمد علي، نشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ١٩٧٦م.

٤ – الطب الشرعي، المستشار منير رياض حنا، الناشر دار الفكر الجامعي، الأسكندرية، مصر، طبعة أولى، سنة ٢٠١١م.

٥ - الاختناق، د. هشام عبدالحميد فرج، المركز القومي للاصدارات القانونية، القاهرة، الطبعة الاولى، سنة ٢٠٠٥م.

٦ - جرائم القتل والاصابة باستخدام الاسلحة النارية، د. هشام عبدالحميد فرج، نشر دار الوثائق، مصر، الطبعة الاولى، سنة ٢٠١٤م.

٧ - الاسلحة النارية في الطب الشرعي، د.حسين شحرور، بدون مكان نشر، الطبعة الاولى، سنة٢٠٠٤م.

٨ – الطب الشرعى في خدمة الأمن والقضاء، د. منصور عمر المعايطة، الرياض . ٢٠٠٧م

٩ – الطب العدلي والتحري الجنائي، د. كاظم المقدادي، ٢٠٠٨م.

١٠ – الطب الشرعي مبادئ وحقائق؛ د. حسين علي شحرور؛ الناشر خاص: الطبعة الاولى؛ ٢٠٠٠م.

١١ - المسؤلية القانونية للطبيب والمستشفى والصيدلي، سمير عبدالسميع الأودن، الناشر منشأة المعارف، الأسكندرية، سنة الطبع ٢٠١١م.

١٢ - جرائم الأطباء والمسؤلية الجنائية والمدنية، عبدالصبور عبدالقوي علي مصري، الناشر دار العلوم، القاهرة، الطبعة الأولى، ٢٠١١م.

١٣ - المسؤولية الطبية، د. منذر الفضل، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٥م.

١٤ – جرائم الإعتداء، على حق الإنسان في التكامل الجسدي، د. حسين عبدالصاحب الربيعي، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، طبعة اولى، سنة ٢٠١١م.

١٥ - المسؤولية القانونية في العمل الطبي، لقمان فاروق حسن نانەكەلي، الناشر مكتبة زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٣.

١٦ – الأدلة الجنائية في الطب الشرعي المعاصر؛ د. علاءالدين مرسي، المركز القومي للاصدارات القانونية، القاهرة، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٤.

١٧ – التكنولوجيا الجرمية الحديثة وأهميتها في الإثبات الجنائي؛ المحامي نصر شومان، بدون ناشر، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١١.

١٨ – حجية البصمة الوراثية في الإثبات الجزائي، د. صفاء عادل سامي، منشورات زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٣.

١٩ – البصمة الوراثية وأحكامها في الفقه الإسلامي والقانون الوضعي، د. عبدالرحمن أحمد الرفاعي، منشورات الحلبي الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٣.

٢٠ – تشريح جثة الإنسان بين الحظر والإباحة؛ د. جمال مهدي محمود الأكشة، دار نشر القانونية، مصر، سنة ٢٠١١.

٢١ – مدى شرعية تشريح جثة الإنسان؛ د. أنور أبوبكر كريم هواني الجاف، المؤسسة الحديثة للكتاب، لبنان، الطبعة الأولى، سنة ٢٠١٠.

٢٢ - نصوص المواثيق والإعلانات والإتفاقيات لحقوق الإنسان، د. السيد أبو الخير، الناشر إيتراك للطباعة والنشر، مصرالجديدة، الطبعة الأولى، سنة ٢٠٠٥م.

٢٣ - حقوق الإنسان، د. حافظ علوان حمادي الدليمي، مطبعة رهند، السليمانية، سنة ٢٠٠٨.

٢٤ - فقه السنة، السيد سابق، دارالكتاب العربي، بيروت، لبنان، طبعة ثالثة، سنة الطبع ١٩٧٧م.

٢٥ - تأريخ الخلفاء الراشدين، د. محمد علي الصلابي، دار الكتاب العربي، بيروت، الطبعة الثانية، ٢٠٠٥م.

٢٦ شرح قانون العقوبات القسم الخاص، د. ماهر عبد شويش الدرة، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، بدون سنة الطبع.

٢٧ - شرح قانون العقوبات القسم الخاص، د. محمد سعيد نمور، الناشر دار الثقافة، عمان،الطبعة الاولى، سنة ٢٠٠٨م.

٢٨ - شرح قانون العقوبات القسم الخاص، د. نشأت احمد نصيف، الناشر الوسسة الحديثة للكتاب، سنة ٢٠١٠م.

٢٩ - شرح قانون أصول المحاكمات الجزائية، د. براء منذر كمال عبداللطيف، دار ابن الأثير للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الطبعة الثانية، ٢٠١٠م.

٣٠ - المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية، اعداد د. جابر مهنا الحسيناوي، مؤسسة العراق للاعلام والثقافة العلمية، بغداد، الطبعة الأولى، ٢٠٠٩م.

٣١ - النظرية العامة للقضاء في الإسلام، د. محيى هلال السرحان، الناشر مركز البحوث والدراسات الإسلامية، بغداد، سنة الطبع ٢٠٠٧م.

٣٢ - أصول التحقيق الإبتدائي أمام النيابة الإدارية، د. عبدالفتاح بيومي حجازى، المركز القومي للإصدارات القانونية، القاهرة، طبعة أولى، سنة ٢٠١١م.

٣٣ - حجية الدليل الفني في المواد الجنائية والمدنية، د. عبدالحكم فودة، الناشر دار الفكر الجامعي، الأسكندرية، مصر، الطبعة الأولى، سنة الطبع ٢٠١٤م.

٣٤ - الدعوى الجزائية وتطبيقاتها القضائية، المحامي جمعة سعدون الربيعي، الناشر المكتبة القانونية، بغداد، طبعة ثانية، ٢٠٠٦م.

٣٥ - المبادئ القانونية في قرارات محكمة تمييز اقليم كوردستان- العراق/ القسم الجنائي؛ (١٩٩٣_٢٠٠٧)، اعداد القاضي عثمان ياسين علي، منشورات إتحاد قضاة اقليم كوردستان العراق، أربيل، الطبعة الأولى، ٢٠٠٨م.

٣٦ – المبادئ القانونية في قضاء محكمة التمييز _ القسم الجنائي_؛ اعداد ابراهيم المشاهدي، نائب رئيس محكمة التمييز، الناشر شهاب احمد الحميد، بغداد، ١٩٩٠.

٣٧ - قانون أصول المحاكمات الجزائية، اعداد القاضي نبيل عبدالرحمن، نشر المكتبة القانونيية، بغداد، طبعة اولى، سنة ٢٠١٢م.

٣٨ - التشريعات العقابية في القوانين العراقية/ الجزء الأول؛ إعداد القاضي سردار عزيز خوشناو، مطبعة منارة، أربيل، ٢٠١٠.

٣٩ - قانون العقوبات العراقى رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩، اعداد القاضي سردار عزيز خؤشناو، مطبعة منارة، أربيل، سنة ٢٠١٠م.

٤٠ - أحكام ومواد القوانين والقرارات المتعلقة بالأحوال الشخصية النافذة في أقليم كوردستان، إعداد االحاكم عونى كمال سعيد البزاز، أربيل، سنة٢٠١٠م.

٤١ - دستور جمهورية العراق ٢٠٠٥، إعداد صباح صادق جعفر الأنبارى، نشر المكتبة القانونية، بغداد.

https.//www.Facebook.com/Drasatw.wbh- 1

٢٠١٣ - ٢ ،droit7.blogspot.com.google.13october

www.comed.uobaghdad. ldu.iq - 3

https// drive. Google. Com - 4

www. Lejuriste. Montadalhilal.com – 5

## پێڕستی بابەتەکان

**بەشی سێیەم:**

**بەشی چوارەم:**



## کمال حسن مجید

سالی لە دایکبوون ١٩٦٦

**بڕوانامە:**

- بەکالۆریۆس لە یاسادا، زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی، لە سلێمانی ٢٠١٢_٢٠١٣.

- بەکالۆریۆس لە شەریعەتدا، كلية المعرفة الجامعة للدراسات الإسلامية والعربية، موصل، ٢٠٠٦_٢٠٠٧.

- فوق دیبلۆم لە تەکنیکی تاقیگەدا، لە دانشگاه علوم پزشکی تهران، ایران، ١٩٨٩ز. (١٣٦٧/٩/٢٤ه.ش).

- دبلۆم لە شیکاری نەخۆشیدا، پەیمانگای هونەریی تەندروستی، موصل، ١٩٨٥_١٩٨٦.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

١ – زیرەکیی عاتیفی (وەرگێران).

٢ – سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاو کاریگەری ئینجیلیەکان لە ئاراستەکردنیدا (وەرگێران).

٣ – زیرەکیی عاتیفیو بەختەوەری خێزان (وەرگێران).

٤ – پزیشکیی دادیی لە خزمەتی مافو دادپارێزیدا (نوسین )